# کاریگەریی پەیماننامەی زەهاو ١٦٣٩ لەسەر کوردستان

## توێژینەوەیەکی مێژووییە

ئەحمەد حەمەدئەمین          دڵشاد مەحموود عەبدولڕەحمان



هەولێر - ٢٠١١






دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **کاریگەریی پەیماننامەی زەهاو ١٦٣٩ لەسەر کوردستان (توێژینەوەیەکی مێژووییە)**
- **نووسینی:** ئەحمەد حەمەدئەمین و دڵشاد مەحموود عەبدولڕەحمان
- **نەخشەسازی ناوەوە:** ڕەوان
- **بەرگ:** حەمیدە یوسفی
- **ژمارەی سپاردن:** (١٠٠٥) لە ساڵی ٢٠١١
- **نرخ:** (٢٠٠٠) دینار
- **چاپی یەکەم:** ٢٠١١
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانە: چاپخانەی ڕۆژهەڵات (هەولێر)**

**زنجیرەی کتێب (٦٠٠)**



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك

# پێشەکی

دەمێکە لە سەرچاوە مێژووییەکان، ناوی پەیماننامەی زەهاو هاوتا لەگەڵ مەسەلەی دابەشکردنی کوردستان دێتە گۆڕێ، بۆ پەردە هەڵماڵین لەسەر کاریگەرییو ئەنجامەکانی ئەو پەیماننامەیە لەسەر کوردستان بیرۆکەی بەئەنجام گەیاندنی ئەم توێژینەوەیە دروستبوو، توێژینەوە لەسەر ئەو پەیماننامەیە گرنگی خۆی هەیە، کە دەکرێ بە هۆیەوە پەی بەڕاستی ململانێی عوسمانیو سەفەوی ببەین لەو سەردەمەدا، هەروەها پەنجە لەسەر ئەو هۆکارانە دابنێین کە ئەو پەیماننامەیەی لە ریزبەندی ڕێککەوتنەکان هەڵداوێرێو دەیکاتە پەیماننامەیەکی نێودێرو کاریگەر، سەرەڕای ئەوەی ئەم توێژینەوەیە لەباریدا هەیە کۆمەڵێك زانیاریی مێژوویی لەبارەی کوردو کوردستانی ئەوکاتە بخاتە ڕوو.

جێی خۆیەتی ئاماژە بەوە بکەین کە دەقی ڕەسەنی پەیماننامەکە لای هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو سەفەوی ونە، بۆیە توێژینەوە لەو بابەتە پێویستی بە زانیاری زۆرو وردبوونەوەی لەسەرخۆ هەیە، بۆ ئەوەی توێژەر بەئاسانی مامەڵە لەگەڵ ئەو زانیاریانە بکاتو ڕاستیو دروستی بابەتەکان بەدیار بخات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کارێکی ئەوەندە ئاسان نییە، کە کاریگەریو ئەنجامەکانی ئەو پەیماننامەیە لەسەر کوردستان دیار بخرێت، بەڵکو دەبێ توێژەر پشت ئەستوور بێت بە زانیاریی



مێژوویی بۆ ئەوەی لێکدانەوەکانی لۆژیکی بێت، لەم جۆرە هەوڵو کۆششانەدا توێژەر تووشی کۆمەڵێك تەنگو چەڵەمە دێت، بە تایبەت کاتێك زۆربەی سەرچاوەکانی کە ڕەسەنو هاوچەرخن بەزمانی جیاجیان کە بێگومان لێتێگەیشتنو وەرگێڕانییان ئاسانییە، ئەوە سەرەڕای کەمیو دەست نەکەوتنیان لە کتێبخانەکانی هەرێم.

ئەم توێژینەوەیە لە پێشەکییەكو دووبەشو ئەنجام پێکهاتووە. بەشی یەکەم: کە بە ناونیشانی کاریگەری ململانێو پەیماننامەکانی عوسمانیو سەفەوییە لەسەر کوردستان لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٥١٤-١٦١٨)، دوو تەوەر لەخۆ دەگرێت، لە تەوەری یەکەمدا ئاماژە بەسەرەتای دەستپێکردنی ئەو ململانێیە کراوەو لەگەڵ هۆکارەکانی سەرهەڵدانو بەردەوامبوونی تا ساڵی (١٦١٨)، کە لەگەڵیشدا کاریگەرییەکانی ئەو شەڕو ململانێیە لەسەر کوردستان دەستنیشانکراوە. لە تەوەری دووەمدا پەیماننامەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو سەفەوی بەر لە پەیماننامەی زەهاو لەگەڵ کاریگەرییەکانیان لەسەر کوردستان ئاماژەی پێکراوە.

بەشی دووەم: کە تایبەتە بە باسکردنی باردۆخو زەمینەی بەستنی پەیماننامەی زەهاو (١٦٣٩)، ئەویش بە دوو تەوەر باسکراوە. تەوەری یەکەم، سروشتی پەیوەندی نێوان هەردوو دەوڵەت بەر لەبەستنی پەیماننامەکە تاوتوێ کراوە، بەتایبەت دوای هەڵگەڕانەوەکەی بەکر سۆباشی لەبەغداو دەست بەسەر داگرتنەوەی بەغدا لە لایەن سەفەوییەکان، کە بەمەش شەڕ دووبارە لەنێوانیاندا هەڵگیرسایەوە کاتێك سەفەوییەکان پێشڕەویان کردو، عوسمانییەکان هەوڵی گێڕانەوەی دەسەڵاتیان بۆ ناوچەکان دەدایەوە، ئەنجام خۆی لە سێ هێرشی یەك لە داوای یەکدا بینییەوە، کە زیانمەندیو شوێنەواری ئەو هێرشانە زۆر بە کوردستانەوە دیار بوو، ئەگەر بزانرێت بە ڕێژەیەکی خاکەڕاییانە کوردەکان لە سوپای دەوڵەتی عوسمانی بەشداربوون تا گێڕانەوەی بەغدا لەسەر دەستی

سولّتانی مورادی چوارەم لە سالّی (١٦٣٨). تەوەری دووەم، تایبەتە بە بارودۆخو زەمینەی بەستنی پەیماننامەی زەهاوو کاریگەری بەسەر کوردستان کە مەبەستی سەرەکی توێژینەوەکەیە، لێرەشدا ئاماژە بە هەولّی هەردوولا بۆ بەستنی پەیماننامەکەو دارِشتنی خالّو ناوەرۆکی پەیماننامەکە کراوە، دواجاریش پەنجە خراوەتەوە سەر ئەو خالّە کاریگەرو گرنگانەی کە پەیماننامەکە بەسەر کوردستانو مێژووەکەیدا بەجێیهێشتووە.

لە ئەنجامدا ئاماژە بەو خالآنە کراوە کە لە دووتوێی توێژینەوەکە پێگەیشتووین.

شیاوی باسە، بۆ بەئەنجام گەیاندنی ئەم توێژینەوەیە پشت بەچەندان سەرچاوەی رِەسەنو نوێ بەستراوە کە بە زمانی جیاجیا نووسراون، لەوانە: مصطفی نعیما الحلبي، تأريخ نعيما(أو-روضة الحسين في خلاصة اخبار الخافقين) کە نووسەرەکەی لە سالّی (١٧١٥) کۆچی دوایی کردووە، ئەم سەرچاوەیە گرنگییەکی زۆری بۆ توێژینەوەکە هەبوو، چونکە نووسەر لە کتێبەکەیدا ئاماژە بەرِووداوە مێژووییەکانی دەولّەتی عوسمانی کردووە لە نێوان سالآنی (١٥٩١-١٦٥٩)، سەرچاوەی (فذلکة کاتب چلبی) کە لە نووسینی (مصطفی عبدالله کاتب چلبی)یەو، لە سالّی (١٦٥٧) کۆچی دوایی کردووە، هیچی لە سەرچاوەکەی دیکە لە رِووی گرنگییەوە کەمتر نییە، ئەگەر بزانین نووسەر لە کتێبەکەیدا ئاماژەی بە رِووداوەکانی نێوان سالآنی (١٥٩١-١٦٥٤) داوەو، هاوچەرخو بەشدار بووی شەرِو ململانێی عوسمانیو سەفەوییەکان بووە، هەروەها سوودمەندی لە کتێبی مێژوونووسی نەمساوی ( فون هامەر) (دولت عثمانية تاريخى) کە لەلایەن (محمد عطا)وە وەرگێرِدراوەتە سەر زمانی تورکی عوسمانی، بە تایبەت بەشی نۆیەمی کە ئاماژەی بە هێرشەکەی سولّتان مورادی چوارەم کردووە لەگەلّ برِگەکانی پەیماننامەی زەهاودا. جیا لەوانەش کتێبەکەی (گلشن خلفا)ی (نظمي زادة مرتضى افندي)، کە نووسەرەکەی لە سالّی (١٧٢٤) کۆچی دوایی کردووە سوودی بۆ توێژنەوەکە بووە، بەتایبەت بۆ ئەو رِووداوانەی کە لە نێوان سالآنی



(١٦٣٨-١٧١٧) رِوویانداوە. گرنگی ئەو سەرچاوانەی کە باسمانکردن بۆ توێژینەوەکە وای کردووە کە چەند جارێك لە پەراوێزەکان دووبارە بکرێنەوە. ئەمە لە لایەك، لەلایەکی دیکەشەوە هەر بۆ ئەم توێژینەوە پشت بە ژمارەیەك سەرچاوەو توێژینەوەی ئەکادیمی بەستراوە وەکو: (منوجهر پارسادوست) بەنێوی (ریشەی تاریخی اختلافات ایرانو عراق١٥١٤-١٩١٤)، (شاكر صابر ضابط) (العلاقات الدولية والمعاهدات الحدود بين العراق وايران)، (جابر الراوي) (الحدود الدولية ومشكلة الحدود العراقية الايرانية)، (عباس العزاوي) (تاريخ العراق بين إحتلالين)، (د. سعدى عثمان هروتى) (كوردستان والامبراطورية العثمانية"دراسة في تطور سياسة الهيمنة العثمانية في كوردستان١٥١٤-١٨١٥م)و، (كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر" دراسة في علاقاتها الادارية والسياسية والاقتصادية مع ايالتي بغداد والموصل")، کە ئەمانەش بە زانیارییەکانیان سوودی زۆریان بە توێژینەوەکە گەیاندووە، ئەمانەو کۆمەلّێکی دیکە لەسەرچاوە کە لە لیستی سەرچاوەکان ئاماژەیان بۆ کراوە هاوکارو پالّپشتی زانیارییەکان نێو ئەم توێژینەوەن.

دیارە ئەم توێژینەوەیە لە کەمو کورتی بەدوور نییە بۆیە دەخوازین بە چاوێکی رِەخنە گرانەوە سەیر بکرێت بۆ ئەوەی لە دواتر لافی توێژینەوەیەکی لەبارو خزمەتکار بۆ مێژووی میللەتەکەمان لێبدات.

## تەوەری یەكەم: ململانێی عوسمانیو سەفەوی
## سەرهەڵدانو بەردەوامبوونی

لەبەرایی سەدەی شازدەهەمدا چەند گۆڕانكارییەك ڕوویدا كە كاریگەرییان هەبوو لەسەر ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەگشتیو كوردستان بەتایبەتی، لەلایەك سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەفەوی لەسەردەستی شا ئیسماعیل سەفەوی (١٥٠١-١٥٢٤) لەسەر خاكی ئێران[١]، لەلایەكی دیكەشەوە وەرچەرخانی سیاسەتی فرازانخوازی دەوڵەتی عوسمانی بوو لە ڕۆژئاواوە بەرەو ڕۆژهەڵات[٢].

شیاوی باسە دوای ئەوەی شا ئیسماعیل بنجی دەسەڵاتەكەی داكوتاو ملی دایە فراوانخوازیو بەرەو كوردستان پەلوپۆی كێشاو، لە شاڵاوەكانیدا تووشی هەندێ بەرەنگاری بۆوە، بەڵام لە دواتردا هەر دەسەڵاتی بەسەر كوردستاندا ڕاگەیشت[٣]. لێرەشدا ئەو فراوانخوازییەی سەفەوییەكان بووە جێگای مەترسی دەوڵەتی عوسمانی، بۆیە سوڵتان بایەزیدی دووەم (١٤٨١-١٥١٢) ڕووی وەرچەرخاند بەرەو ڕۆژهەڵاتو ناڕەزایی دەربڕی بەرانبەر شائیسماعیل[٤]، هەروەها لەهەمان كاتیش نێردراوی خۆی ڕەوانەی لای شائیسماعیل كرد، بەڵام شائیسماعیل

[١] راجر سیوری، ایران عصر صفوی، ترجمە: كامبیزی عزیزی، چاپ أول، تهران، ١٣٧٢ هەتاوی، ل٢٥.

[٢] محمد فرید بك المحامي، تاریخ الدولة العلیة العثمانیة، بیروت،١٩٧٧، ص٧٢.

[٣] شەرەفخانی بەدلیسی، شەرەفنامە، وەرگێڕانی: هەژار، نەجەف، ١٩٧٢، ل ٤٢٨.

[٤] سەبارەت بە گواستنەوەی قورسایی ستراتیژییەتی دەوڵەتی عوسمانی لە ڕۆژئاواوە بەرەو ڕۆژهەڵات هۆكارگەلێكی زۆر دەست نیشان كراون، بە شێك لەوانە پەیوەندی بە كوردەوە هەیە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: د. سعدی عثمان هروتی، كوردستان والامبراطوریة العثمانیة"دراسة في تطور سیاسة الهیمنة العثمانیة في كوردستان١٥١٤-١٨١٥م، الطبعة الاولى، مطبعة خانی، دهۆك، ٢٠٠٨، صص٣٥-٣٩.



بایەخێكی ئەو تۆی پێنەدا، لەبەر ئەوەی ئەوكاتە لە خۆبایو سەرمەستی سەركەوتنە یەك لە دوایەكانی بوو كە لە شەڕەكان بەدەستی دەهێنا[٥]، ئەمەش وای كرد لەدواتر لەگەڵ هاتنە سەر حكومی سوڵتان سەلیمی یەكەم (١٥١٢-١٥٢٠) كە بە یاوز[٦] ناسرابوو هەوڵی خۆئامادەكردن بۆ شەڕو ململانێی لەگەڵ شا ئیسماعیل بدا[٧].

هۆكاری سەرهەڵدانی ململانێی عوسمانیو سەفەوی بیروڕای جیاوازی لەنێو سەرچاوە مێژووییەكانی تایبەت بەو سەردەمە دروست كردووە[٨]، بەڵام هۆكاری سەرەكی سەرهەڵدانی ململانێی نێوانیان دەگەڕێتەوە بۆ چاوتێبرینی هەردوو دەوڵەت بۆ دەست بەسەر داگرتنی ناوچە ستراتیژەكەی كوردستان كە مەبەستیان بوو بیخەنە ژێر قەڵەمڕەوی خۆیان[٩]، جا چ بۆ مەبەستی قازانجی ئابووری بێت، بەهۆی بەپیتی زەوییەكەی، یان بۆ قازانجی بازرگانی كە ئەو كاتە كوردستان شوێنی سەر ڕێگای بازرگانی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواوە بووە، ئەو جگە لەوەی دەیانتوانی سوود لە هێزی سەربازی ناوچەكە وەربگرن لە ڕێگای هێزە مرۆییەكەو شوێنە سەختەكانی كوردستان كە بۆ موڵگەی سەربازی بەكەڵكبوون.

سەرەتای سەرهەڵدانی ململانێكە بەشێوەی پراكتیكی لێرەوە دەستپێكرد كاتێك سوڵتان سەلیمی یەكەم سوپای كۆكردەوەو شەڕی دژی سەفەوییەكان ڕاگەیاندو، لە

[٥] لونگریك، اربعة قرون من تاریخ العراق الحدیث، ترجمة: جعفر خیاط، الطبعة السادسة، بغداد، ١٩٨٦، ص٣٠.

[٦] یاوز، واتە هەورە تریشقە، ئەمەش نازناوی سوڵتان سەلیمی یەكەم بوو، لەبەر بێبەزەییو دڵڕەقی لەكارەكانی پێیان دەوت. د.شەمسی محەمەد ئیكسەندەر، مێژووی كورد لە سەدەی١٦، وەرگێڕانی: شوكر مستەفا، چاپی یەكەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیر، هەولێر، ١٩٩٨، ل ٩٢.

[٧] نظمي زادة مرتضى افندي، گلشن خلفاء، ترجمة: موسى كاظم نورس، مطبعة الاداب، النجف، ١٩٧١، ص١٨٥.

[٨] بۆ زیاتر زانیاری لەمەڕ هۆكارەكانی سەرهەڵدانی ململانێی نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو سەفەوی بڕوانە: د. سعدی عثمان هروتی، المصدر السابق، ص٣٧.

[٩] د. سعدي عثمان هروتي، نفس المصدر، ص٣٩.

٢٤ی نیسانی ١٥١٤ کەوتە ڕێ بەرەو ڕۆژهەڵات[١٠]، لێرەشدا ژمارەیەکی بەرچاو لە کوردەکان هاوشان لەگەڵ سوپای عوسمانی لەو پێشڕەوییە بەشدار بوون، چونکە کوردەکان لە ڕێگای مەلا ئیدریسی بەدلیسی[١١] یەوە، کە کەسایەتییەکی خوێندەوارو ژێری ئەو ڕۆژگارە بوو، هاوپەیمانییەتی زارەکییان لەگەڵ دەسەڵاتدارانی عوسمانی بەستبوو[١٢]. لەبەرانبەر پێشڕەوی سوپای عوسمانی، سوپای سەفەوی هەوڵیدا بەو پەری توانایەوە ڕووبەڕووی ئەو هێرشە بوەستێن، بەڵام زۆری نەخایاند دەستیان بە پاشەکشە کردو پەیڕەوی "زەوی سوتان"یان کرد[١٣]، لەگەڵ ئەوەش هەوڵیاندا پارێزگاری لە تەوریزی پایتەخت بکەن، ئەنجام هەر دوو هێزەکە لە٢٣ی ئابی ١٥١٤ لە دەشتی چالدێران بەیەککەشتنو شەڕەکەش بە سەرکەوتنی عوسمانییەکان کۆتایی هات[١٤].

سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بە هۆکاری سەرکەوتنی عوسمانییەکان دەکەنو دەیگەڕێننەوە بۆ تۆپە کاریگەرەکانی عوسمانیو برینداربوونی شائیسماعیلو ڕاکردنی لە بەرەکانی جەنگدا[١٥]،جگە لەوە هەندێکی دیکە بۆ خراپی باری دەروونی سوپای سەفەوی دەبەنەوە، لەبەر گیرانی خۆر بە دوو ڕۆژ بەر لە شەڕەکە کە کاریگەری لەسەریان هەبووە، لەبەر ئەوەی لەکۆنەوە خۆر بەپیرۆزی سەیر کراوە لای ئێرانییەکان[١٦]، بەڵام وێڕای ئەوانەش دەتوانرێت بوترێ بەشداریکردنی هێزە کوردییەکان لە شەڕەکە

[١٠] د.ابراهيم خليل أحمد، تاريخ الوطن العربي في العهد العثماني ١٥١٦-١٩١٦، جامعة الموصل، ١٩٨٦، ص ٢٤.

[١١] مەلا ئیدریسی بەدلیسی، ناوی تەواوی ئیدریس کوڕی حیسامەددین کوڕی عەلییە، خەڵکی شاری بەدلیسە بۆیە بە بەدلیسی ناوی دەرکردووە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: محەمەد بایراقدار، ئیدریسی بدلیسی، وەرگێڕانی: شکور مستەفا، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ١٩٩٩.

[١٢] شەرفخانی بەدلیسی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٦٤.

[١٣] د. سعدي عثمان هروتي، المصدر السابق، ص٤٠.

[١٤] عبداللە رازی، تاریخ کامل ایران" از تأسیس سلسلة ماد تا انقراض قاجاریة"، تهران، ١٣٧٤ هەتاوی، ل ٤١٥.

[١٥] راجر سیوری، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٤؛ د. ابراهيم خليل أحمد، المصدر السابق، ص٢٥ .

[١٦] حسين مجيب المصري، صلات بين العرب والفرس والترك" دراسة تاريخية ادبية"، قاهرة، دون سنة الطبع، ص ٤٠٢.



لە پاڵ سوپای عوسمانی ڕۆڵی خۆی بووە، چونکە پشکدار بوونی هێزە کوردییەکان لە هەر بەرەیەکیاندا تای تەرازووی هێزەکەی بەلای خۆیدا کێش دەکرد.

بە هەڵوەستەکردنو وەستان لەسەر کاریگەری ئەنجامی شەڕی چالدێران دەبینین زەرەروو زیانێك زۆری بۆ هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو سەفەوی هەبووە، بەڵام زۆرترینی بە ناوچەکانی کوردستانەوە دیارە، ئەگەر بزانیین جگە لە زیانی مادیو مرۆیی، لە ئەنجامی ئەو شەڕە کوردستان بووە دوو بەشو، بەشە گەورەکەی بەر دەوڵەتی عوسمانیو بەشە بچووکەکەی بەر دەوڵەتی سەفەوی کەوت[١٧]، ئەوە سەرەڕای ئەوەی لە دوایشدا کوردستان بەهۆی هەڵکەوتە جوگرافییەکەی کە کەتبووە سنووری نێوانیان بووە گۆڕەپانی سەرەکی ململانێی چوارد ساڵەی عوسمانیو ئێرانی[١٨].

ئەنجامی شەڕی چالدێرانو دوای ئەویش شەڕی قۆچ حەسسار لە (١٥١٦)[١٩] کۆتایی بە شەڕو ململانێی عوسمانیو سەفەوی نەهێنا، لەبەر ئەوەی ئەگەری هەڵگیرسانەوەی شەڕی هەموو کاتێك لە ئارادا بوو، چونکە هەر دوولا لە یەکتر بەگۆمان بوونو بۆ دەرفەتێك دەگەڕان تاوەکو مەرامەکانیان بهێننە دی، بەتایبەت سەفەوییەکان، هەوڵی گێڕانەوەی ناوچەکانی ڕۆژئاوای چیاکانی زاگرۆسو کوردستانیاندەدا کە لە شەڕەکاندا لەدەستیان دابوون[٢٠]. کاریگەری ئەو هەوڵدانەو

[١٧] د. سعدي عثمان هروتي، المصدر السابق، ص٤٣. دەبێت ئەوەش بووترێت کە یەکێك لە ئەنجامە پۆزەتیڤەکانی شەڕی چالدێران دوورخستنەوەی دەسەڵاتی سەفەوی بوو لە ناوچە کوردییەکان، دواتریش گۆڕانی سیاسەتی سەفەوی بوو بەرانبەر بە میرو میرنشینە کوردییەکان.

[١٨] د.جلیلی جەلیل، کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، وەرگێڕانی:د. کاوس قەفتان، بەغدا، ١٩٨٧، ل٢٦؛ نەجاتی عەبدوڵڵا، کوردستانو کێشەی سنوری عوسمانی- سەفەوی ١٦٣٩-١٨٤٧، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١، ل٢٨.

[١٩] بۆ زانیاری لەسەر شەڕی قۆچ حەسسار بڕوانە: د. سعدي عثمان هروتي، المصدر السابق، ص٥٦.

[٢٠] م. س. لازاریڤ، کێشەی کورد١٨٩٦-١٩١٧، وەرگێڕانی: د. کاوس قەفتان، بەغدا، ١٩٨٩، ل٤٤.

گردبوونەوەی هەندێ هۆکاری دیکەی لاوەکیو، دەست بەتاڵبوونی سوڵتان سلێمانی قانوونی (١٥٢٠-١٥٦٦) لەبەرەی ڕۆژئاوا، وایکرد سولتان شەڕ لەدژی سەفەوییەکان ڕابگەیەنێو سوپایەك بەسەرۆکایەتی ئیبراهیم پاشا[٢١] ڕەوانە بکا. لێرەشدا سوپای عوسمانی توانی دەست بگرێت بەسەر ناوچەیەکی فراوانو، تا ئەوەی بۆ جارێکی دیکە لە١٣ی تەمموزی ١٥٣٤ تەورێزی پایتەختی گرتەوەو خستیەوە ژێر دەسەلاتی، لێرەشدا ئەگەرچی سوپای عوسمانی بەرەو ناوەوەی وڵاتی فارس کشا، بەڵام لەبەر سەختی ناوچەکەو سەرمای زستانە زۆری نەبرد کشایەوە[٢٢].

بە چۆڵکردنەوەی شاری تەورێز لەلایەن سوپای عوسمانی، شاتەهماسپی یەکەم (١٥٢٤-١٥٧٦) هێزی هێنایەوەو دەستی بەپێشڕەوی کردو تاوەکو شاری وان هات[٢٣]، بەڵام هەلاتنی ئەلقاس میرزای برای شا بۆ لای عوسمانی، هانی سولتان سلێمانیدا بۆ ئەوەی جارێکی دیکە هێرش بکاتەوە سەر دەوڵەتی سەفەوی لە ساڵی (١٥٤٨)[٢٤]، بەڵام ئەنجامی ئەو جەنگەش کۆتایی بە ململانێیەکان نەهێنا، ئەگەر بزانیین جارێکی دیکەش دوای کشانەوەی سوپای عوسمانی شاتەهماسپی یەکەم سوپا هێناوەتەوەو دەستی بەهێرشکردن کردۆتەوە، لەبەرانبەر ئەوەشدا سوپای عوسمانی بە توندی بەرپەرچیداوەتەوە، تا لە ئەنجامدا زنجیرەیەك شەڕی یەك لەدوای یەکی لێکەوتەوە، کە بەدەست بەسەر داگرتنی عوسمانییەکان بۆ ناوچەکانی تەورێز، خووی، مەرەند،

(٢١) ئیبراهیم پاشا لە پلەی سەدری ئەعزەمی بوو لەو سەردەمەدا. بۆ زیاتر زانیار بڕوانە: مورتمان، مادة ابراهیم باشا، دائرة المعارف الاسلامیة، مجلد الاول، ص ١٦١-١٦٢.

(٢٢) محمد فرید بك المحامي، المصدر السابق،ص ٩٠.

(٢٣) نظمي زادة مرتضى افندي، المصدر السابق، ص١٩٨.

(٢٤) راجر سیوری، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٠.



ورمێو دونبولی کۆتایی هات[٢٥]، لە دوایشدا جەنگی بیست ساڵەی عوسمانیو سەفەوی بەبەستنی پەیماننامەی ئەماسیا لە ساڵی لە ٢٩ی مایسی ١٥٥٥ کۆتایی هات[٢٦].

لە ڕاستیدا هەر دوو دەوڵەتی عوسمانیو سەفەوی تا بیستو سێ ساڵ پابەندی بەندەکانی پەیماننامەی ئەماسیا بوون، بەڵام ململانێی نێوانیان بنەبڕ نەبوو، ئەوەتا کاتێك دوای مردنی شاتەهماسپی یەکەم لە ساڵی ( ١٥٧٦) بارودۆخی ناوخۆی دەوڵەتی سەفەوی دەکەوێتە خراپی بەهۆی گێرمەو کێشە لەسەر دەسەڵاتو، لە ئەنجامدا شا محەمەد خوادبەندە (١٥٧٨-١٥٨٧) دێتە سەرحوکم، ئەو بارودۆخە هانی سولتان موڕادی سێیەم (١٥٧٤-١٥٩٥) دەدات بۆ بەرژەوەندی خۆی بیقۆزێتەوە، لێرەشدا دەست پێکردنەوەی شەڕو هێرش بردن لەلایەن عوسمانییەکان، دووبارە دەرفەتی ئەوەی پێدان دەست بەسەر تەورێز بگرنەوە، ئەوە سەرەڕای ئەوەی توانیان دەست بگرن بەسەر ناوچەی شارەزوورو بەشێکی وڵاتی ئێران[٢٧]، بەڵام دواتر سوپای عوسمانی تووشی بەرەنگارییەکی توندوتیژ هاتەوە بەهۆی هاتنی حەمزە میرزای تەختگیری شا (ولی عهد) کە توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێو سوپای عوسمانییەکان لە تەورێز بکاتە دەرەوە[٢٨].

شیاوی باسە، لەگەڵ هاتنە سەرکاری شاعەباسی یەکەم (گەورە) (١٥٨٧-١٦٢٩) دووبارە هەردوولا کەوتنەوە گفتوگۆ بەمەبەستی ڕێککەوتن، چونکە شاعەباسی یەکەم هەوڵێدەدا بارودۆخی دەرەکی یەکلای بکاتەوە، بۆیە هەردوولا پەیماننامەیەکیان بەست بەناوی پەیماننامەی

(٢٥) ئەولیاچەلەبی، کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا( یان سیاحەتنامەی ئەولیاچەلەبی)، وەرگێڕانی: ناکام، بغداد، ١٩٧٩، ل ١٦١-١٦٢ .

(٢٦) د. سعدي عثمان هروتي، المصدر السابق، ص٨٨.

(٢٧) نظمي زادة مرتضى افندي، المصدر السابق، ص٢٠٩-٢١٠؛ عباس العزاوي، تاریخ العراق بین إحتلالین، الجزء الرابع، بغداد،١٩٥٣، ص١١٨.

(٢٨) منوجهر پارسادوست، ریشەی تاریخی اختلافات ایرانو عراق١٥١٤-١٩١٤، چاپ چهارم، تهران، ١٣٧٠هەتاوی، ل٤٢.

فەرهاد پاشا"نەورۆز" لە ساڵی (١٥٩٠)[٢٩]، ئەو پەیماننامەیەش ماوەی سێزدە ساڵان هـەردوولا پابەندی بەندەکانی بوون، بەڵام کاتێك شاعەباسی یەکەم بەرەی ڕۆژهەڵاتی لەگەڵ ئۆزبەگـەکان[٣٠] یەکلای کردەوەو، دەسـتیکرد بەچاکـسازی بـاری سـەربازیو بـاری نـاوخۆی وڵات[٣١]، هـەوڵی گێڕانەوەی ئەو ناوچانەی بەرەی ڕۆژئاوای وڵاتەکەیدا کە لە دەستیچووبوون، لەو کاتەشدا بارودۆخی دەوڵەتی عوسمانی ئاڵۆز بـوو بـەهۆی بـەردەوامی شـەڕ لەگـەڵ نەمـساو، تێکهەڵـچوونی بـاری ناوخۆی[٣٢]. ئەمەش ڕێگای لەبەردەم شاعەباسی یەکەم خۆشکرد تا لە ساڵی (١٦٠٣) دەست بە هێرش بکاتو دەست بگرێتەوە بەسەر تەورێز، نەخچەوانو ڕوان، لەگەڵ ئەوەشـدا شـاری وانـیش داگیر بکات[٣٣]. ئیتر دوای بـەدوای زنجیـرە شـەڕێکی نێوانیـان بـەهۆی خراپـی بـاری نـاوخۆی هەردوولاو بارودۆخەکە بەرەو هێمنی هەنگاوی ناو پەیماننامەیەکیان بـە نـاوی نـسوح پاشـا لـە ساڵی(١٦١١) بەست، بەڵام ئەو پەیماننامەیە ماوەیەکی زۆری نەخایاند دووبارە شەڕ ڕوویدایەوەو، لەپاشان جارێکی دیکە پەیماننامەیەکی دیکەشان بەست لە ساڵی (١٦١٣) بـەناوی پەیماننامـەی ئەستەنبوڵ، کەچی جارێکی دیکەش کەوتنەوە شەڕ لـە سـاڵی (١٦١٥) تـا ئـەوەی ئـەمجارەیان شاعەباسی یەکەم نوێنەری ڕەوانە کرد بۆ مەبەستی ڕێککەوتن، بەمەش شەڕی ئەمجارەشـیان بـە پەیماننامەی سەراو لە ساڵی (١٦١٨) کۆتایی هات[٣٤].

---

[٢٩] دواتر باسی ناوەڕۆکی ئەو پەیماننامەیە دەکەین.

[٣٠] ئۆزبەك، هۆزێکی تورکمان بوون توانیان دەست بگرن بەسەر تورکستان، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: کارل بروکلمان، تاريخ الشعوب الاسلامية، ترجمة: نبية فارس ومنير البعلبكي، الطبعة السابعة، بيروت، ١٩٧٧، ص٤٩٧.

[٣١] بۆ زیاتر زانیار لەمەڕ چاکسازییەکانی شاعەباس بڕوانە: محمد پناهی سمنانی، شا عباس کبیر، چاپ أول، تهران، ١٣٧٣ هەتاوی.

[٣٢] محمد فريد بك المحامي، المصدر السابق، ص ١١٩.

[٣٣] محمد فريد بك المحامي، نفس المصدر، ص ١٢٠.

[٣٤] بۆ کاریگەری ئەو شەڕو ململانێیان لەسەر کورستانو بەشداریکردنی کورد تیایدا بڕوانە: د.سعدي عثمان حسين، كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر" دراسة في



لێرەشدا ئەگەر بە وردی سەیری کاریگەریو ئەنجامەکانی ململانێـی نێـوان هـەردوو دەوڵـەتی عوسمانیو سەفەوی بکەین دەبینین زۆربەی زۆری بە ناوچەکانی کورستانەوە دیـارە، ئـەویش بـەهۆی هەڵکەوتە جیۆپۆلیتکی کوردستان لە نێوان هەردوو دەوڵەتو بەلادانەکـەوتنی ململانێـی سیاسـیو چەکداریو درێژەکێـشانی شـەڕەکان، لەبەرئـەوەی کوردسـتانی لەچـەند لاوە تێـوە دەگلانـدو[٣٥]، زەرەرووزیانی زۆری لە ڕووی مادیو مرۆیـی بـە خـەڵکی کوردسـتان دەگەیانـد، ئـەویش لـە ڕووی بەشداریکردنی کوردەکان لەشەڕەکان لەلایەكو، کاولکردنی ناوچە کوردییەکان بە هۆی شـەرەکان لـە لایەکی دیکەوە[٣٦]. ئەوە سەرەڕای ئەوەی ئەو ململانێیە هۆکارێك بوو بۆ دواکەوتنی باری ئـابووری کوردستان، لەبەر ئەوەی خەڵکی کوردستان بەهۆی شەڕەکان نە دەپڕژانـە سـەر ئیشوکارەکانیـانو، بەڵکو زۆرجار دەبوون بە پاسەوانی سەر سنوور[٣٧]. هـەروەها شـەڕەکان لـە ڕووی کۆمەڵایەتیـشەوە کاریگەری خۆی کردە سەر ناوچەکانی کە شەڕ دەیانی گرتـەوە، کـە بەهۆییـەوە بەشـێك لـە هـۆزە کوردەکان لە زێدی بابو باپیرانیان کۆچ پێکران، یان وایان لێکـرا تـەنیا بـیر لەبەرژەوەنـدی خۆیـان بکەنەوە نەك نەتەوەکەیان، هەر بۆیەش لە ئەنجامی ئەوەدا کوردەکـان هـەر جـارەو پاڵیـان دەدا بـە لایەکداو، لێرەشدا مەبەستی سەرەکی هەردوو دەوڵەت لە پەیڕەوکردنی ئەو سیاسەتە ڕێگاگرتن بوو لەبەردەم سەرهەڵدانو گەشەسەندنی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی لە کوردستاندا[٣٨].

---

علاقاتها الادارية والسياسية والاقتصادية مع ايالتي بغداد والموصل"، مطبعة سيما، كتێبفرۆشی سۆران، اربيل، ٢٠٠٦، ص ٢٧٩-٢٨١.

[٣٥] نەوشیروان مستەفا ئەمین، کوردو عەجەم مێژوی سیاسی کوردەکانی ئێران، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٥ ،ل ٢١.

[٣٦] د. كمال مظهر أحمد، دراسات في تاريخ ايران الحديث و المعاصر، بغداد، ١٩٨٢، ص٢٤.

[٣٧] فەرید ئەسەسەرد، گەشەسەندنی سەرمایەداری لە کوردستاندا زەمینەی ئابوورینەی بزوتنەوەی نەتەوایەتی، چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ، ١٩٨٤، ل ٢٠.

[٣٨] لازاریف، تێکۆشان هەر بەردەوامە، وەرگێڕانی: سەنتەری برایەتی، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە(٧) هەولێر، ١٩٩٧، ل١٤.

# تەوەری دووەم: پەیماننامەکانی نێوان عوسمانیو سەفەوی بەر لەپەیماننامەی زەهاو

هەرچەندە هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو سەفەوی ماوەیەکی دوورو درێژ لەشەڕو ململانێیەکی توندوتیژدابوون دژ بەیەکتری، بەمەبەستی فراوان کردنی قەڵەمڕەوی خۆیان لەسەر حیسابی یەکترو ناوچەکانی دەوروبەریان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ماوە ماوە دوای هەر زنجیرە شەرێك دەکەوتنە وتووێژو گفتوگۆ بەمەبەستی ئاشتەواییو بەستنی پەیماننامە لەگەڵ یەکتردا، لێرەشدا دەتوانرێت بوترێ کە مەبەستی سەرەکیان لە بەستنی ئەو پەیماننامانە بۆ سوود وەرگرتن بوو لە کاتو خاوکردنەوەی گرژی نێوانیان، هەروەها بەسەر پێ خستنەوەی سوپاکانیانو تەیارکردنیان بوو بۆ قۆناغێکی دیکە لە شەڕو ململانێی، جگە لەوەش ئەگەر بێتو بە وردی سەیر بکەین ئەم سیاسەتە لە مێژووی گشت شاکانی سەفەوی بەدی دەکرێت هەر کاتێك ئەگەر هەستیان بکردایە بەرانبەر بەهێزی دوژمن هیچیان پێناکرێت ئەوا داوای ئاشتەواییو بەستنی پەیماننامەیان دەکرد[٣٩]. لێرەشدا ناوەرۆکی ئەو پەیماننامانە باس دەکەین کە بەر لە پەیماننامەی زەهاو بەستراون.

(٣٩) د.جابر ابراهيم الراوي، الحدود الدولية ومشكلة الحدود العراقية الايرانية، بغداد، ١٩٧١، ص٢٨.



## پەیماننامەی ئەماسیا (١٥٥٥)

وەك لەمەوبەر ئاماژەمان بۆ کرد جەنگی بیست ساڵەی نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو سەفەوی بەبەستنی پەیماننامەی ئەماسیا لە ٢٩ی مایسی ١٥٥٥ کۆتایی هات، ئەم پەیماننامەیەش لە نێوان شاتەهماسپی یەکەمو سوڵتان سلێمانی قانونی بەسترا، ئەوەی زەمینەی خۆشکرد بۆ بەستنی ئەو پەیماننامەیە خراپی بارودۆخی ناوخۆو هەرەشەی دەرەکی بوو لەسەر هەر دوولا[٤٠]، هەروەها تێك شکانی شاتەهماسپی یەکەم لە شەڕەکاندا پاڵنەرێك بوو بۆ ڕەوانە کردنی نێردراوی خۆی بۆ داواکردنی ئاشتەوایی[٤١]، ئەوەش یەکەمین پەیماننامە بوو بەسترا لە نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو سەفەوی، ئەگەرچی لە بەڵگەنامەیەکی فەرمی نێوانیان نەنوسراوەتەوە، بەڵکو تەنیا خۆی لەچەند نامەیەکی نێوان شاو سوڵتانو کاربەستانی هەردوولا باسی لێوەکراوە[٤٢].

شیاوی باسە، بە گوێرەی پەیماننامەکە هەر دوولا پێکهاتبوون لەسەر چەند خاڵێك: لەوانە داننانی دەوڵەتی عوسمانی بە دەوڵەتی سەفەوی لە ئێران، لەبەرانبەر ڕەزامەندی شاتەهماسپی یەکەم بەحوکمڕانی دەوڵەتی عوسمانی لەسەر عیراق، لەگەڵ دانەوەی ئەیالەتی قارسو قەڵاکانی دەوروبەری بە دەوڵەتی عوسمانی، ئەوە لە لایەك، لە لایەکی دیکەشەوە دیاریکردنی سنووری شارەزوور بەمەبەستی نەهێشتنی ململانێی نێوانیان، ئەوە سەرەڕای ڕێگەدان بە هاتنی حاجییەکانی ئێرانو سەلامەتیان لەکاتی سەردانکردنیان بۆ ناوچە پیرۆزەکانی شیعەکان لە عیراقو چوونیان بۆ حیجاز، هەروەها هەردوولا ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی دالدەی نەیارانی یەکتر نەدەنو لە کاتی دەستگرتن بەسەریاندا بیدەنەوە بەیەکتری[٤٣].

(٤٠) نەوشیروان مستەفا ئەمین، لە پەراوێزی مێژوی ئەردەلان، سلێمانی،١٩٩٩، ل ٤٧.

(٤١) د.جابر ابراهيم الراوي، المصدر السابق، ص ٩٩.

(٤٢) نەوشیروان مستەفا ئەمین، میرایەتی بابان لە نێوان بەرداشی ڕۆمو عەجەم دا، چاپی دووەم، سلێمانی، ١٩٩٨، ل ٣٩.

(٤٣) شاكر صابر ضابط، العلاقات الدولية والمعاهدات الحدود بين العراق وايران، بغداد، ١٩٦٦، ص١٩.

## پەیماننامەی فەرهاد پاشا" نەورۆز" (١٥٩٠)

دوای ئەوەی دووبارە هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو سەفەوی کەوتنەوە شەڕ، ئەمجارە لەگەڵ هاتنە سەر حوکمی شاعەباسی یەکەم (١٥٨٧-١٦٢٩)و بیرکردنەوەی لە چارەسەرکردنی باری ناوخۆیو دەرەکی وڵاتو یەکلاکردنەوەی بەرەی شەڕەکان لە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا، هەڵسا بە ڕەوانەکردنی نوێنەری خۆی بۆ دەوڵەتی عوسمانی بەمەبەستی ئاشتەوایی[٤٤]، ئەنجام هەر دوولا بۆ جارێکی دیکە لە ٢١ی مارتی ١٥٩٠ پەیماننامەکیان بەست کە لەسەرچاوە تورکییەکان بە پەیماننامەی فەرهاد پاشاو[٤٥]، لەسەرچاوە فارسییەکانیش بە پەیماننامەی نەورۆز ناسراوە[٤٦].

لە ناوەرۆکی پەیماننامەکەدا هاتبوو ئەیالەتەکانی تەورێز، شیروان، گورجستان، بەشی ڕۆژئاوای ئازەربێجان لەگەڵ شارەزوورو لورستان بۆ دەوڵەتی عوسمانی بێ، ئەوە لەلایەك، لە لایەکی دیکشەوە هاتبوو مەرجە لەسەر دەوڵەتی سەفەوی لە وتاری ڕۆژی هەینیدا سووکایەتی بەسێ خەلیفەی یەکەمی ئیسلام( ئەبوبەکر، عومەرو عوسمان) نەکا، هەروەها بۆ دەستەبەربوونی جێبەجێ کردنی پەماننامەکە هەمزە میرزای برازای شاعەباسی یەکەم وەکو بارمتە لای دەوڵەتی عوسمانی دانرا، تا شاعەباس لە پەیماننامەکە پاشگەز نەبێتەوە، ئەوە سەرەڕای ئەوەی تیایدا هاتبوو هەردوولا نابێت داڵدەی نەیارانی یەکتر بدەن[٤٧].

## پەیماننامەی نسوح پاشا (١٦١١)

[٤٤] نەوشیروان مستەفا ئەمین، لە پەراوێزی مێژووی...، ل٥٠.

[٤٥] شاكر صابر ضابط، المصدر السابق، ص ٢١.

[٤٦] مظفر زنگنە، دورمانی أریاتی( کردو کردستان)، چاپ سیهەم، بێ شوێنو ساڵی چاپ، ل١٢٦-١٢٧.

[٤٧] شاكر صابر ظابط، المصدر السابق، ص ٢١" منوجهر پارسادوست، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٨.



دوای چاککردنەوەی باری ناوخۆی وڵاتو یەکلاکردنەوەی شەڕ لەبەرەی ڕۆژهەڵات، شاعەباسی یەکەم کەوتەوە شەڕ لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی، ئەنجامی زنجیرەیەك شەڕ دووبارە هەر دوولا کەوتنەوە گفتوگۆ، ئەمجارەش شاعەباسی یەکەم نێردراوی ڕەوانەکرد، بەڵام دەوڵەتی عوسمانی مەرجێکی پێشینەیی خستە بەردەم نوێنەری شا، ئەویش بەستنی پەیماننامەیەك بوو لەسەر هەمان ناوەرۆكو بەندەکانی پەیماننامەی ئەماسیای ساڵی (١٥٥٥)ی سەردەمی سوڵتان سلێمانی قانوونی، کەچی نوێنەری شا وای پێ باشتر بوو کە پەیماننامەکە بە هەمان ناوەڕۆکی پەیماننامەی فەرهاد پاشا(نەورۆز)ی ساڵی (١٥٩٠) بێت[٤٨]، ئیتر دوای ڕازی بوونیان، هەردوولا پەیماننامەیەکیان بەست کە بە پەیماننامەی نسوح پاشا لە ساڵی (١٦١١) ناسراوە. لە ناوەڕۆکی پەیماننامەکەدا هاتووە دەبێت دەوڵەتی عوسمانی واز لە ناوچەکانی تەورێز، شیروانو وان بهێنێ بۆ دەوڵەتی سەفەوی، لەبەرانبەر بەخشینی دووسەد بار لە ئاوریشم بە دەوڵەتی عوسمانی لە لایەن دەوڵەتی سەفەوی بە شێوەیەکی ساڵانە، هەروەها هەردوولا ڕێککەوتوون لەسەر پێکهێنانی لێژنەیەك، بۆ دیارکردنی سنووری نێوانیان لە ئازەربێجانو ئەرمینیا، بەڵام باس لە ناوچەی شارەزوور نەکراوە کە هۆکاری سەرەکی ململانێیەکەیان بووە[٤٩].

## پەیماننامەی ئەستەنبووڵ (١٦١٣)

دوای بەستنی پەیماننامەی نسوح پاشا ساڵی (١٦١١) زۆری نەخایەند شەڕ کەوتەوە نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو سەفەوی، بەڵام ئەمجارەش دوای ماوەیەك هەوڵی ئاشتەواییو پەیماننامە بەستنیاندا، ئەنجامی گفتوگۆی نێوانیان خۆی لە پەیماننامەی ئەستەمبۆڵی ساڵی (١٦١٣)دا بینیەوە، ناوەرۆکی پەیماننامەکە ژمارەیەك خاڵی لە خۆگرتبوو، کە تاڕادەیەك لە پەیماننامەکانی دیکە باسی لێوە کرا بووو

[٤٨] شاكر صابر ظابط، المصدر السابق، ص٢٣.

[٤٩] محمد احمد پناهی سمنانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٢.

لەسەری ڕێککەوتبوون[٥٠]، بەڵام ئەوەی تایبەتە بە کوردستان، لەو پەیماننامەیەدا هاتبوو:" ئەگەر حکومەت هەڵسا بە کۆتایی هێنانی حوکمی هەڵۆخان لە ئەیالەتی شارەزوور( مەبەستی حکومەتی عوسمانیو هەڵۆخانی میری میرنشینی ئەردەڵانە-توێژەر) پێویستە لەسەر دەوڵەتی سەفەوی هیچ یارمەتییەکی مادیو مەعنەوی نەدا"[٥١]. لێرەشدا کۆکیو تەبایی هەر دوولا بەدیاردەکەوێت کە بۆ لێدانو بنەبڕکردنی دەسەڵاتی کوردی هاوڕاو هاوتەبا بووینە.

## پەیماننامەی سەراو (١٦١٨)

سەرهەڵدانەوەی ململانێیو زنجیرەیەك شەڕی دیکە بەبەستنی پەیماننامەی سەراو لە ٦ی ئەیلولی ١٦١٨ کۆتایی هات، سەرەتاش وەکو مەرجی بەستنی پەیماننامەکە دەبوو شاعەباس ساڵانە (٢٠٠) بار ئاوریشم بۆ دەوڵەتی عوسمانی ڕەوانە بکات وەکو پابەند بوون بەو مەرجەی کە لە پەیماننامەکانی پێشوودا هاتبوو، ئینجا هەر دوولا پەیماننامەکەیان مۆرکرد[٥٢].

لە ناوەڕۆکی پەیماننامەی سەراودا هاتبوو سنووری هەردوو دەوڵەت دیاربکرێت لەسەر هەمان شێوەی پەیماننامەی ئەماسیای ساڵی (١٥٥٥)، جگە لە گۆڕانکارییەك ئەویش بەخشینی ناوچەی ئەخسخە[٥٣] بە دەوڵەتی عوسمانی

(٥٠) بۆ زیاتر زانیاری لەمەڕ خاڵەکان بڕوانە: شاکر صابر ظابط، المصدر السابق، ص٢٤.

(٥١) شاکر صابر ظابط، نفس المصدر و الصفحة.

(٥٢) عباس العزاوي، المصدر السابق، الجزء الرابع، ص١٦٣-١٦٤.

(٥٣) ئەخسخە، دەکەوێتە ناوچەی تەفلیس لە جۆرجیای ئێستاکە. بارتولد، مادة اخالضيخ، دائرة المعارف الاسلامية، المجلد الثاني، ص٤١٦.



لەبەرانبەر دانی هەردوو ناوچەی دەرنەو دەرەتەنگ[٥٤] بەدەوڵەتی سەفەوی، ئەوە لەلایەك لە لایەکی دیکەشەوە تیایدا هاتبوو دەبێت هەردوولا نوێنەر ڕەوانەی لای یەکتر بکەن بەمەبەستی دڵنیا بوون لەیەکتریو گوێڕاڵبوونیان بۆ پەیماننامەکە[٥٥].

ئەوەی لێرەدا پێویستە هەڵوەستەی لەسەر بکەین کاریگەری ئەو پەیماننامانەیە لەسەر کوردستان، لەبەر ئەوەی ئەگەر بەووردی سەیری بەندەکان بکەین ئەوا بۆمان دەردەکەوێت ئەو پەیماننامانە کاریگەری زۆریان هەبووە لەسەر کوردستان، چونکە لە ناوەڕۆکی پەیماننامەکان باس لەچارەسەرکردنی تەنگژەی سنووری نێوان هەردوولا کراوە، ئەوەش ڕوونو ئاشکرایە کوردستان لەوکاتە کەتبووە ژێر قەڵەمڕەوی ئەو دەوڵەتەوە، بەمەش کاتێك سنووری نێوانیان دیاری دەکرد، ئەوا کورستانیان لە نێوان خۆیان دابەش دەکرد، جا کامیان لەکاتی بەستنی پەیماننامەکە بەهێزتر بوایە ئەوا بەشی زیاتری لەخاکی کوردستان بەردەکەوت، لەبەر ئەوەی ئەو دابەشکردنە بێ گوێ دانە ڕەگەزو زمانو ئاینو ئاینزا بوو، ئەوە سەرەڕای ئەوەی هۆزەکانیشیان لەیەکتر دادەبڕی[٥٦]، چونکە ئەو ناوچە کوردیانەیان دابەش دەکرد لە نێو خۆیان لە ڕووی ڕەگەزەوە کورد بوونو، لە ڕووی زمانەوەش زمانیان کوردی بوو، هەروەها لە ڕووی ئاینو ئاینزاشەوە لەسەر ئاینی ئیسلامو زۆربەشیان سوونی مەزهەب بوون.

لەڕاستیدا ئەو پەیماننامانە بوونە ڕێگر لەبەردەم یەکگرتنی میرنشینە کوردییەکان کە دەسکەوتی ئابووری بەیەکیانی دەبەستایەوە، چونکە لە شوێنێکی جوگرافی داخراو دابوون، بۆیە دەیان توانی لەو سەردەمە یەکبگرنو ببن بە ناوکی پێکهێنانی دەوڵەتێکی نەتەوەیی بۆ کورد[٥٧]. ئەوە لەلایەك، لەلایەکی دیکەشەوە ئەگەر تەماشای ناوەڕۆکی پەیماننامەکان بکەین ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە زۆر جەخت لەسەر ئەوەی کراوەتەوە کە هاوکاریو

(٥٤) درەنەو دەرەتەنگ، دوو ناوچەن سنوورەکانی باکوورو باشووری زەهاو پێکدەهێنن. سەرجەمی ئەو پەیماننانەی بەندن بەکێشەی نێوان تورکو فارس، وەرگێڕانی: نەزەند بەگیخانی، گۆڤاری کاروان، ژمارە(١١) خوولی ڕاپەرین، هەولێر، ١٩٩٤، ل١٩.

(٥٥) شاکر صابر ظابط، المصدر السابق، ص٢٧؛ د.جابر ابراهيم الراوي، المصدر السابق، ص٢٢٠.

(٥٦) نەوشێروان مستەفا ئەمین، میرایەتی بابان...، ل ٤٠.

(٥٧) هەمان سەرچاوەو لاپەرە.

هەماهەنگی کوردەکان نەکرێت، بۆیە دەتوانرێت بوترێ هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو سەفەوی وەکو داگیرکەری کوردستان لەسەر هیچ کۆکو تەبا نەبوو بن ئەوە لەسەر لێدانی کوردو هاوکاری نەکردنی کۆکو تەبا بووینە، چ جای ئەوەی کاتێك پەیماننامەکانیان بەستووەو دەستیان بەتاڵ بووە، هەردوولا لە سنووری دەسەڵاتی خۆی هەڵساون بە لێدانی کوردو کەمکردنەوەی دەسەڵاتی میرەکانو، ڕاگوێزانی کوردەکان لە زێدی باووباپیرانیان[٥٨]. بەمەش دەتوانرێت بوترێ چۆن کوردو کوردستان لە کاتی شەڕو ململانێکانی نێوان عوسمانیو سەفەوی زەرەرووو زیانی زۆری پێکەتووە ئاوەهاش لە کاتی پەیماننامەکان سوودمەند نەبووە.

---

[٥٨] مەبەستمان لێدانی خانی لەپ زێڕینە لەلایەن شاعەباس یەکەم، لەگەڵ ئەو ڕاگوێزانەی کە ئەنجامیدا لەماوەی حکومڕانی، هەروەها لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی عوسمانیش هەڵسان بەلێدانی جانبولاٌ بەگ. بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی ئەو ڕاگوێزانەی سەردەمی شا عەباس بڕوانە: کلیم الله توحیدی" کانیمال"، حرکات تاریخی کرد بەخراسان، جلد أول، چاپ دوم، مشهد، ١٣٧١هەتاوی، ل٣٦. بۆ زانیاری لەمەڕ لێدانی خانی لەپ زێڕین بڕوانە: محمد جمیل رۆژبەیانی، فەرمانڕەوای موکریان، بەغدا، ١٩٩٢، ل ٧٦ بەدواوە. بۆ زانیاری لەمەڕ لێدانی جابولاد بەگ بڕوانە: محمد امین زکي، خلاصة تاریخ الکرد والکردستان من اقدم العصور التاریخیة حتی الان، ترجمة: محمد علي عوني، مصر، ١٩٣١، ص١٩٩-٢٠٠.

## بەشی دووەم:

## بارودۆخو زەمینەی بەستنی پەیماننامەی زەهاو ١٦٣٩



## تەوەری یەکەم: سروشتی پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو سەفەوی بەر لەبەستنی پەیماننامەکە

ئەگەر بێتو چاوێك بەمێژووی پەیوەندی نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو سەفەوی بخشێنین بەر لەبەستنی پەیماننامەی زەهاو، ئەوا دەبینین دوای ئەوەی هەردوو دەوڵەت کۆك بوون لەسەر بەندەکانی سەراوی ساڵی (١٦١٨)، ماوەیەك هێمنیو ئارامی باڵی خۆی کێشا بەسەر پەیوەندی نێوانیاندا، لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا بارودۆخی دەوڵەتی عوسمانی بەوپەڕی خراپی دادەڕۆیشت، بەهۆی هاتنە سەر حوکمی کۆمەڵێك لە سوڵتانی بێ هێزو کەم دەسەڵات، کە لەدوای مردنی سوڵتان سلێمانی قانوونی لە ساڵی (١٥٦٦) هاتبوونە سەر حوکم، جگە لەوەش هەر لەو کاتەدا هێزی ئینکشاری دەستی خستبووە ناو کاروباری دەوڵەتەوە[٥٩]، کەچی باری ناوخۆی ئەوکاتە دەوڵەتی سەفەوی بەبارودۆخێکی گەشەکردوو دادەڕۆیشت لە ئەنجامی ئەو هەوڵو کۆششانەی شاعەباسی یەکەم دەیدای بۆ پێشخستنی باری وڵات[٦٠]. بەمەش هەردوولا بە گومانەوە سەیری باری ناوخۆی یەکتریان دەکردو ئەگەری کەوتنەوەی شەڕ لەنێوانیاندا لە هەموو کات چاوەڕوان دەکرا.

---

[٥٩] محمد فرید بگ، المصدر السابق، ص١٥٢.

[٦٠] محمد پناهی سمنانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠ بە دواوە.

شیاوی باسە هۆکاری سەرهەڵدانەوەی شەڕی ئەمجارە هەڵگڕانەوەی بەکر سۆباشی[٦١] بوو لە ساڵی (١٦١٩) لە بەغدا، چونکە بەکر سۆباشی کاتی بانگی هەڵگەڕانەوەکەیدا هانای بۆ شاعەباسی یەکەم بردو ئەویش بە فرسەتی زانی خۆی تێ هەڵقورتێنێ، بەمەش سەر لەنوێ گۆمی مەندی پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو دەوڵەت وەشلەقان کەوت، کاتێك شاعەباسی یەکەم سوپایەکی سەفەوی بەسەرۆکایەتی سەرداری هەمەدان سەفی قولی خانو، بە بەشداری هەریەك لە خان ئەحمەد خانی ئەردەلانو حوسێن خانی سەرداری لوڕستان ڕەوانە کرد، ئیتر بە بیستنی ئەو هەواڵە ئەستەنبوولّ ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر بوونی بەکر سۆباشی بە والی لەسەر بەغدا، بەمەش سۆباشی ڕەتی ئەوەی کردەوە کە یارمەتی لە سوپای سەفەوی وەربگرێت، بۆیە لە لایەك ئەو هەواڵە شاعەباسی یەکەمی توڕەکردو، لە لایەکی دیکەشەوە ڕێگر نەبوو لەبەردەم ئەوەی سوپای سەفەوی لە چوونە پێشەوەی ڕابووەستێت، ئەنجام سوپای سەفەوی توانی گەمارۆی شاری بەغدا بداتو لە ٢٨ی تشرینی دووەمی ١٦٢٣ بچێتەوە ناوییەوە[٦٢]. لێرەشدا سوپای سەفەوی تەنیا بەگرتنی شاری بەغدا وازی نەهێنا، بەڵکو سوپایەکی دیکەی بەسەرۆکایەتی قرچقای خان بەرەو شاری کەرکووکو مووسڵ ڕەوانە کرد، بەڵام نەیتوانی ماوەیەکی زۆر تیایاندا بمێنێتەوە[٦٣]. لەم ماوەیەشدا هەوڵی زۆر درا بۆ ئاشتەواییو وەستاندنی شەڕ تەنانەت لە لایەن خودی شاعەباسەوە، بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو، چونکە هەر دوولا زۆر بەگرنگییەوە دەیانڕوانییە پێگەی شاری بەغداوە[٦٤].

(٦١) بەکر سۆباشی سەرۆکی هێزی ئینکشاری بوو لەبەغدا، ساڵی١٦١٩ لە دەسەڵات هەڵگەڕایەوە، بەڵام دواتر دەوڵەتی عوسمانی سازشی لەگەڵ کرد، ئەنجام لەگەڵ گرتنەوەی شاری بەغدا لە لایەن هێزی سەفەوییەکان لە ساڵی١٦٢٣ کوژرا. نظمي زادة مرتضى افندي، المصدر السابق، ص٢١٥-٢٢٠.

(٦٢) لونگریك، المصدر السابق، ص٧٥؛ منوجهر پارسادوست، سەرچاوەی پێشوو، ل٥١.

(٦٣) بۆ زیاتر زانیار بڕوانە، د.سعدی عثمان حسین، المصدر السابق، ص٢٨٢-٢٨٤.

(٦٤) لونگریك، المصدر السابق، ص٧٥.



لە بەرانبەر ئەو پێشێلکاریانەی سەفەوییەکاندا، عوسمانییەکان دەستە وەستان نەبوون، بەڵکو بەرەنگارییەکی بەهێزیان کردن، ئەگەر بزانیین لەو کاتەدا لە دەوڵەتی عوسمانی سوڵتان مورادی چوارەم (١٦٢٣-١٦٤٠) لەسەر تەخت بوو، بۆ ئەو مەبەستەش سوڵتانی ناوبراو سوپایەکی ئامادەکرد بەسەرۆکایەتی سەدری ئەعزەم حافز ئەحمەد پاشا بۆ گێڕانەوەی ئەو ناوچانەی لەدەستیان دابوو، سوپای ئامادەکراو لە ساڵی (١٦٢٤) دەستی بەپێشڕەوی کرد، کە لەناویاندا ژمارەیەك میری کوردی بەشداربوون[٦٥]. سوپای عوسمانی دوای ئەوەی دەستی گرتەوە بەسەر هەریەك لە مووسڵو کەرکووك، ئینجا ڕووی کردە بەغداو گەمارۆیدا، ئەنجام دوای نۆ مانگ لە گەمارۆدان سوپای عوسمانی پاشەکشەی کردو گەمارۆی سەر شارەکەی هەڵگرت[٦٦]، لێرەشدا سەرچاوەکان هۆکاری سەرنەکەوتنی سوپای عوسمانی لەگرتنەوەی شاری بەغدا بۆ مانەوەیان بۆ ماوەیەکی زۆر لە ناوچەکە دەگێڕنەوە، گوایە یارمەتیان وەکو پێویست پێنەگەیشتووە، ئەگەرچی خودی شاعەباسی یەکەم بەشداری یەکێك لەو شەڕانەی کردووە کە لە نێوانیان ڕوویداوە، ئەوەش کاریگەری هەبووە لەسەر سەرکەوتنو بەرزکردنەوەی گیانی سەربازانی سەفەوی[٦٧].

لەگەڵ ئەوەی عوسمانییەکان لە هێرشی یەکەمدا سەرکەوتوو نەبوون، بەڵام لە هەوڵدان نەوەستان، بەڵکو ئەمجارەش هێزیان کۆکردەوەو، سوڵتان مورادی چوارەم، سوپایەکی بەسەرۆکایەتی سەدری ئەعزەم خەسرۆ پاشاو بە هاوڕێیەتی هەر یەك لە سەید خانی میری بادینان، میرە بەگی میری سۆرانو ژمارەیەك لە خەڵکی ناوچەکە ڕەوانە کرد[٦٨]، کاتێك سوپا گەیشتە شاری کەرکووك کۆبوونەوەیەکیان بەستو بڕیاری ئەوەیاندا سەرەتا هێرش بکەن بۆ سەر ناوچەی شارەزوور لە ترسی ئەوەی نەبادا لەکاتی گەمارۆدانی شاری بەغدا خان ئەحمەد خان میر ئەردەلان کە ئەوکاتە لە دەرباری

(٦٥) نظمي زادة مرتضى افندي، المصدر السابق، ص٢٢٢؛ محمد امين زكي، المصدرالسابق، ص٢١٣.

(٦٦) منوجهر پارسادوست، سەرچاوەی پێشوو، ل٥١؛ کورد لەئیسلوکۆپیدیای ئیسلامدا، وەرگێڕانی: حەمە کەریم عارف، چاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٩٩، ل٧٢.

(٦٧) راجر سیوری، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٦-٨٧؛ سعدی عثمان حسین، المصدر السابق، ص٢٨٦.

(٦٨) محمد امين زكى، المصدرالسابق، ص٢١٤.

سەفەویدابوو لە دواوە لە سوپای عوسمانی بدات[٦٩]. دوای ئەوەی سوپا بەرەو ناوچەی شارەزوور کشا توانی پێشڕەوی بکات بێ ئەوەی تووشی بەرەنگارییەکی ئەوتۆ بێت، چونکە زۆرێك لە میر کوردەکانی ئەو ناوچەیە لایەنگیری خۆیان نیشاندا بۆ دەوڵەتی عوسمانی جگە لە خان ئەحمەد خان نەبێت[٧٠]، لێرەشدا دەتوانرێت بوترێ لەلایەك ئەو هەڵوێستەی میرە کوردەکان بەرانبەر بەهاتنی سوپای عوسمانی دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری خراپی سیاسەتی سەفەوییەکانو، لە لایەکی دیکەش هاومەزهەبی عوسمانییەکان کاریگەری هەبوو لەگەڵ کوردەکان.

بەبیستی دەنگوباسی دەست بەسەر داگرتنی ناوچەی شارەزوور لەلایەن عوسمانییەکان، شاسەفی (١٦٢٩-١٦٤٢) هەڵسا بەکۆکردنەوە سوپایەك بە سەرۆکایەتی والی شاری هەمەدان زەینەڵ خانو بە هاوڕێیەتی خان ئەحمەد خانی ئەردەڵان، بەمەش سوپا ڕووەو سوپای عوسمانییەکان هاتن، ئەنجام هەردوولا لەنزیك قەڵای مەریوان بوو بەشەڕیانو کۆتایی شەڕەکەش بەسەرکەوتنی عوسمانییەکان کۆتایی هات دوای ئەوەی یارمەتی پێویستیان پێگەیشت[٧١]، دوای سەرکەوتنی سوپای عوسمانی لەو شەڕە، سوپا ڕووی کردە قەڵەمڕەوی میرنشینی ئەردەڵانو کاولکارییەکی زۆرتێدا کرد[٧٢]، ئینجا بەرەو ناوەوەی دەوڵەتی سەفەوی هەنگاوینا و

[٦٩] لونگريك، المصدر السابق، ص٨٧-٨٨؛ علي شكر علي، تأريخ العراق في العهد العثماني١٦٣٨-١٧٥٠"دراسة في احواله السياسية، الطبعة الاولى، مطبعة دار الشعب، بغداد، ١٩٨٤، ص٥١.

[٧٠] مصطفى نعيما الحليي، تأريخ نعيما(أو-روضة الحسين في خلاصة اخبار الخافقين)، الجزء الثالث، استانبول، ١٢٨١هجرية، ص١٩.

[٧١] مصطفى عبدالله كاتب چلبى، فذلكة كاتب چلبى، الجزء الثاني، حوادث مطبعة سى،استانبول، ١٢٨٥الهجرية ، ص١١٩-١٢٠؛ لونگريك، المصدر السابق، ص ٨٨.

[٧٢] صالح قەفتان، مێژووی نەتەوەی کورد حالەتی سیاسی، مێژووی کۆمەڵایەتی، ئاوەدانی گەلی کورد، لەسەرەتای مێژووە، چاپخانەی سلمان الاعظمي، بەغدا، بێ ساڵی چاپ، ل٢٩١.



دەستی گرت بەسەر شاری هەمەدان، بەڵام بەگەیشتنی فەرمانی سوڵتان سوپای عوسمانی لە پێشڕەوی وەستاو ڕووی وەرچەرخاند بەرەو بەغدا، کە مەبەستی سەرەکی هێرشەکە بوو، لێرەشدا سوپای عوسمانی کەوتنە کاولو وێرانکردنی ئەو ناوچانەی بەدەم ڕێگاوە پێدا تێپەربوون[٧٣]، کە زۆربەیان ناوچەی کوردنشین بوون. کاتێکیش سوپای عوسمانی گەیشتە دەورووبەری بەغدا گەمارۆیدا، بەڵام ئەمجارەش سەرکەوتنی بەدەست نەهێناو گەمارۆکەی شکانو گەڕایەوە[٧٤].

سەرچاوەکان ئاماژە بۆ هۆکاری سەرنەکەوتنی سوپای عوسمانی دەکەن لە گێڕانەوەی بەغدا لەم جارەیاندا، ئەویش بۆ مانەوەی سوپای عوسمانی دەگێڕنەوە بۆ ماوەیەکی زۆر لە ناوچەی شارەزوور، لەبەر ئەوەی خەریکی چاککردنەوەی قەڵای گوڵعەنبەر[٧٥] بوون کە لەسەر دەستی شاعەباسی یەکەم کاولکرابوو[٧٦]. شیاوی باسە سوپای عوسمانی لەگەڕانەوەیدا هێشتا نەگەیشتبووە شاری مووسڵ، خان ئەحمەد خانی ئەردەڵان بە هاوکاری هێزێکی سەفەوی بەسەرۆکایەتی تۆختەخان دەستی گرتەوە بەسەر ناوچەی شارەزوورو خستەیەوە چوارچێوەی قەڵەمڕەوەکەی[٧٧].

[٧٣] نظمي زادة مرتضى افندي، المصدر السابق، ص٢٢٠؛ عباس العزاوي، المصدر السابق، الجزء الرابع، ص١٩٩.

[٧٤] فون هامەر، دولت عثمانية تاريخى، مترجمى: محمد عطا، الجزء التاسع، استانبول، ١٣٣٥، ٢٥١؛ مصطفى نعيما الحليي، المصدر السابق، الجزء الثالث، ص٥٤.

[٧٥] قەڵای گوڵعەنبەر، قەڵایەکی تۆکمەو بەهێز بوو، لەسەر دەستی سوڵتان سلێمانی قانوونی دروستکرا بوو. ئێستاکە پاشماوەکەی دەکەوێتە شارۆچکەی هەڵەبجەو سەر بە پارێزگای سلێمانییە. مأمون بك بن بيكه بك، مذكرات مأمون بك بن بيكه بك، ترجمة: محمد جميل الروژبيانى و شكور مستەفا، مطبعة المجموع العلمي العراقي، بغداد، ١٩٨٠، ص١٢.

[٧٦] علاء نورس، العراق في العهد العثماني" دراسة في العلاقات السياسية١٧٠٠-١٨٠٠، بغداد، ١٩٧٩، ص٤٧.

[٧٧] مصطفى عبدالله كاتب چلبى، المصدر السابق، ص١٣١.

دوای ئەوەی سوپای عوسمانی لە هەردوو هێرشەکەی پێشوو سەرکەوتنی بەدەست نەهێناو نەیتوانی شاری بەغدا بگێڕێتەوە بۆ ژێر قەڵەمڕەوی خۆی، بۆ هەمان مەبەست سوڵتان موراد هەڵسا بەڕێکخستنی سوپایەکی ڕێکوپێکو پڕچەك بەسەرۆکایەتی خۆی، لێرەشدا سەرچاوەیەك ئەو هێرشە لە هێرشەکانی دیکە جیادەکاتەوە، لەبەر ڕێکوپێکی سوپاکەو وردبین لە داڕشتنی نەخشەی هێرشەکەدا[78]. ئیتر دوای تەواوبوونی ڕێکخستنی سوپاو ئامادەکردنی پێداویستییەکانی، سوڵتان موراد بە خۆیو سوپاکەیەوە لە ٨ی مایسی ١٦٣٨ لە ئەسکودار[79] دەرچووو ڕووەو حەلەب هەنگاوی ناو لە ڕێگادا ژمارەیەك لە خەڵکی ناوچەکە هاتنە ڕیزی سوپاکەیەوە، دوای ئەوەش سوپا چووە بیرەچك[80]و سوڵتان فەرمانیدا کە چەكو تەقەمەنییەکان لە ڕێگای ئاوەوە بگوازرێتەوە، بەمەش سوپا ڕوویکردە دیاربەکر بۆ ئەوەی سوپای زیاتر کۆبکاتەوە تا دواجار لە ٧ی تشرینی دووەمی ١٦٣٨ گەیشتنە مووسڵ، لەوێشەوە لە ١٠ی هەمان مانگدا هاتنە کەرکوك، ئیتر دوای مانەوەی دە ڕۆژ بەشێکیان بۆ شارەزوور ڕەوانەکراو[81]، بەشەکەی دیکەشیان بەرەو بەغدا هەنگاویان نا، کەمەبەستی سەرەکی هێرشەکەیان

(78) فون هامەر، المصدر السابق، الجزء التاسع، ص٢٤٤.

(79) ئەسکودار، کۆنترینو گەورەترین گەرەکی پایتەختی عوسمانییەکان بوو، کە دەکەوێتە بەشی ئاسیا لە بسفۆر، بەهۆی ستراتیژی شوێنەکەی ببووە بنکەیەکی سەرەکی بۆ گشت هێرشە گەورەو بچووکەکان کە لەپایتەختەوە بۆ بەرەی ئاسیا دەردەچوو. کراموز، مادة اسکودار، دائرة المعارف الاسلامية، المجلد الثالث، ص٣٣٧-٣٣٨.

(80) بیرەچك، شارێکە لە خاکی جزیرە لەسەر لای چەپی ڕووباری فورات، ئەوکاتەش لەژێر بەڕێوەبەرایەتی ئەیالەتی حەلەب بوو بەگوێرەی دابەشبوونی ئیداری عوسمانی، لەگەڵ ئەوەشدا بنکەیەکی بازرگانی بوو لە نێوان باکووری شامو باشووری کوردستان. سترك، مادە بیرەچك، دائرة المعارف الاسلامية، المجلد الرابع، ص٣٨٩.

(81) فون هامەر، المصدر السابق، الجزو التاسع، ص٢٥٠.



بووە[82]. لێرەشدا جێی خۆیەتی ئاماژە بۆ بەشداریکردنی ژمارەیەکی زۆر لە هۆزە کوردییەکان ناوچەی هەولێرو کەرکوکو مووسڵو ناوچەکانی دیکە بکەین، کە لەتەك سەرۆك هۆزو پیاوە ناودارەکانی ناوچەکە لەگەڵ سوپای عوسمانی بەشدارییان کردووەو ڕۆڵی بەرچاویان گێڕاوە[83].

شیاوی باسە، لەگەڵ گەیشتنی سوپای عوسمانی بۆ دەروبەری شاری بەغدا جارێکی دیکە هەوڵی خۆ ڕێکخستنیدا بەر لەوەی بکەوێتەوە شەڕەوە بۆ ئەوەی سەرکەوتن بە دەست بهێنێ، بۆ ئەو مەبەستەش هەڵسان بەلێدانی خەندەقو دابەشکردنی سوپاکە بە ناوچەکەدا، بەمەش گەمارۆیەکی سەربازی توندوتیژی خستە سەر شارەکە[84]. لێرەشدا حاکمی سەفەوییەکان لە بەغدا بەگتاش خان سەرەتا هەوڵی ئەوەیدا پارێزگاری لە دەسەڵاتەکەی بکات، بەڵام دوای ئەوەی لە نێوان سوپای هەردوولا بووە شەڕ، سەرکردەکانی سەفەوی لە نێوخۆیاندا دەستیان بەگفتوگۆ کرد، بڕیاری ئەوەیاندا خۆیان بەدەستەوە بدەن، بۆیە دوای چل ڕۆژ لە گەمارۆدان سوپای عوسمانی لە ٢٥ی کانوونی دووەمی ١٦٣٨ توانی شاری بەغدا بخاتەوە ژێر قەڵەمڕەوی[85]. بەمەش دەسەڵاتی عوسمانی ئەمجارەیان لەبەغدا درێژەی هەبوو تا هاتنی سوپای ئینگلیزەکان لە ساڵی (١٩١٧)[86].

(82) علي شاكر علي، المصدر السابق، ص٦٠؛ علاء نورس، المصدر السابق، ص٦٥.

(83) محمد امين زكي، المصدر السابق، ص٢١٤؛ صديق الدملوجي، امارة بهدينان، الموصل، ١٩٥٢، ص١٣١؛ د.سعدي عثمان حسين، المصدر السابق، ص٢٨٩-٢٩٠.

(84) مصطفى نعيما الحلبي، المصدر السابق، الجزء الثالث، ص٣٦٣.

(85) نظمي زادة مرتضى افندي، المصدر السابق، ص٢٣٠-٢٣٤؛ فون هامەر، المصدر السابق، الجزء التاسع، ص٢٥٤-٢٦١.

(86) شكري محمود نديم، حرب العراق١٩١٤-١٩١٨، الطبعة الثامنة، بغداد، ١٩٧٤، ص١٣٥.

## تەوەری دووەم: زەمینەی بەستنی پەیماننامەی زەهاو و کاریگەریی لەسەر کوردستان

دوای گێڕانەوەی شاری بەغدا لەسەر دەستی سوڵتان مورادی چوارەم لە ساڵی (١٦٣٨)، مستەفا پاشا سەدری ئەعزەم کرا بەوالی لەسەر ئەیالەتی بەغداو، لەلایەن سوڵتانەوە ڕاسپێردرا بۆ ڕێکخستنەوەی باری ناوچەکە[٨٧]، ناوبراویش بۆ هەمان مەبەست ڕووی کردە ڕۆژهەڵاتو لەوێشدا چاوی کەوت بەنوێنەری دەوڵەتی سەفەوی کە بۆ مەبەستی ئاشتەواییو بنبڕکردنی ململانێی نێوانیان هاتبوو، بەڵام لەم کۆبوونەوەیەدا ئەنجامێکی ئەوتۆیان بەدەست نەهێنا، تەنیا ئەوندە نەبێت کە ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کۆبوونەوەی داهاتوویان لە قزلرەبات[٨٨] بێت[٨٩].

دوای ئەوەی ئەمجارەیان نوێنەرانی هەردوو دەوڵەت، کە پێکهاتبوون لە: مستەفا پاشا لەدەوڵەتی عوسمانیو، محەمەد قولی خان لە دەوڵەتی سەفەوی، بەیەکگەیشتنو

[٨٧] نظمي زادة مرتضى افندي، المصدر السابق، ص٢٣٣.

[٨٨] قزلرەبات، سەعدیە ئێستاکە دەکات کە سەر بەقەزای خانەقینە لە پارێزگای دیالە. لسترنج، بلدان الخلافة الشرقية، ترجمة: بشير فرنسيس وكوركيس عواد، مطبعة الرابطة، بغداد، ١٩٥٤، ص٨٧.

[٨٩] فون هامەر، المصدر السابق، الجزء التاسع، ص٢٦٨؛ علي شاكر علي، المصدر السابق، ص٧٧.



دەستیان بە تاوتوێکردنی مەسەلەکان کرد" لە ئەنجامی گفتوگۆی نێوانیاندا مستەفا پاشا بە نوێنەری دەوڵەتی سەفەوی وت:"چۆن تۆ داوای ئاشتەوایی دەکەیتو کلیلی دەرەتەنگت نەهێناوە"[٩٠]، هەروەها پێشی لەسەر ئەوە داگرت کە دەبێ دەوڵەتی سەفەوی دان بەدەسەڵاتی عوسمانی بنێ لەسەر ناوچەی قارس، ئەوە سەرەڕای ئەوەی باسی لە جموجۆڵی سەفەوییەکان کرد لەسەر ناوچە سنوورییەکان کە بۆ دەوڵەتی عوسمانی جێگای مەترسی بوو[٩١].

لە ڕاستیدا ئەو مەرجانەی کە مستەفا پاشا بە نوێنەری دەوڵەتی سەفەوی ڕاگەیاند پێویستی بەمشتومڕو تەگبیروڕا هەبوو، بۆیە هەواڵی بە شاسەفی ڕاگەیاندراو خاڵەکانی تێگەیاند، ئەویش ڕەزامەندی لەسەر داواکارییەکان دەربڕیو سوپا لە دەرەتەنگ کێشایەوە، بەمەش نوێنەرانی هەردوو دەوڵەت لە زەهاو لە نزیك قەسری شیرین لە ٨ی مایسی ١٦٣٩ بەیەکگەیشتنو، کۆبوونەوەی ئەمجارەشیان بەئامادەبوونی ساروخان نوێنەری شاسەفیو ژمارەیەك لە گەورە پیاوانو میری میرانو سەردارە سەربازییەکان بەڕێوەچوو، کە لە ئەنجامدا ئەوپەیماننامەیە لە ١٧ی مایسی ١٦٣٩ هاتە دی[٩٢]، کە لە مێژوودا بە پەیماننامەی زەهاو یان زەهاب یاخود قەسری شیرین ناودەبرێ.

یەکێك لە خاڵە هەرە گرنگەکانی پەیماننامەکە دیاریکردنی سنووری نێوان هەر دوو دەوڵەتی عوسمانیو سەفەوی بوو، لێرەشدا بە گوێرەی ئەو پەیماننامەیە سنووری دەوڵەتی عوسمانی لەو ناوچانە پێکدەهات: جەسان، بەدرە، مەندەلی، درەنەو دەرەتەنگ کە گشتیان لە ژێر قەڵەمڕەوی ئەیالەتی بەغدا بوون، هەروەها ئەو سنوورە درێژ دەبۆوە تا دەگاتە ئەو ناوچەیەیی کە پێدەوترێت سەرپیل لە زەوی و

[٩٠] فون هامەر، المصدر السابق، الجزء التاسع، ص٢٦٨.

[٩١] شاكر صابر ظابط، المصدر السابق، ص٣٣؛ جابر الراوي، المصدر السابق، ص٢٢٧.

[٩٢] فون هامەر، المصدر السابق، الجزء التاسع، ص٢٦٩؛ عباس العزاوي، المصدر السابق، الجزء الرابع، ص٢٣٧؛ شاكر صابر ظابط، المصدر السابق، ص٣٣؛ د.جابر ابراهيم الرواي، المدصر السابق، ص٢٢٧.

زارەکانی دەورووبەرییەوە لەگەڵ هەردوو تیرەی زیائەددینو هارونی لە هۆزی جاف، ئەمانە هەموویان دەکەونە سنووری قەڵەمڕەوی عوسمانییەوە، جگە لە وانەش ئەو دەشتانەی دەکەونە ڕۆژئاوای قەڵای زنجیرو قەڵای زەڵم لەگەڵ گشت چیاکانی دەرووبەری تا دەگاتە شارەزوورو قەڵای قزلجە مولکی دەوڵەتی عوسمانییەو، بۆ دەوڵەتی سەفەوی نییە دەست بخاتە نێو کاروباری ناوخۆی هیچ کام لەو قەڵاو گوندو شاخو تەپۆڵکانەی کە دەکەونە خاکی ئەخسخە، قارس، وان، شارەزوور، بەغداو بەسرا، بەڵام ئەوەی تایبەتدارە بە سنووری دەوڵەتی سەفەوی پێکدێت لەو قەڵایانەی کە دەکەونە بەشی دووەمەوە لەنێوان مەندەلییەوە تا دەگاتە دەرەتەنگ لەگەڵ ئەو گوندو باخچەو قەڵایانەی هەورەمانو مەریوان، لەگەل هەردوو تیرەی بیرەو زەردووی لە هۆزی جاف، بەمەش بۆ دەوڵەتی عوسمانی نییە دەست بخاتە نێو کاروباری ناوخۆی ئەو ناوچانەوە. ئەوە لەلایەك ، لەلایەکی دیکەشەوە لە بەندێکی پەیماننامەکەدا بڕیاری تێکدانو کاولکردنی هەریەك لە قەڵای قوتورو ماکۆ لە نزیك وانو، قەڵای مەغازبرد لە نزیك قارسو قەڵای زنجیر درابوو. ئەوە سەرەڕای ئەوەی هەندێ بەندی دیکەی دووبارە وەکو پەیماننامەکانی پێشوو لە ناوەرۆکی پەیماننامەکە ئاماژەی پێکرابوو(٩٣).

دوای ئەوەی نێردراوی هەردوو دەوڵەت ڕەزامەندی خۆیان لەسەر بەندەکانی پەیماننامەکە دەربڕی، ئینجا ناوەرۆکەکەی بۆ شاسەفی ڕەوانە کراو، ئەویش بە نامەیەك ڕەزامەندی خۆی لەسەر ڕاگەیاندو لە ڕێگای محەمەد قولی خان نامەکەی بۆ سولتانی عوسمانی ڕەوانە کرد، کاتێکش محەمەد قولی خان گەیشتە ئەستەنبوول پێشوازییەکی گەرمی لێکراو بە خزمەتی سولتان گەیشت، بەمەش سولتان مورادی چوارەم ڕەزامەندی لەسەر ناوەڕۆکی پەیماننامەکە پێشانداو بە نێردراوی شادا نامەیەکی بۆ شا ڕەوانە کرد(٩٤)، هەروەها نێردراوی شا لە گەڕانەوەشیدا لە بەغدا

(٩٣) بۆ زانیاری زیاتر لەمەڕ ناوەرۆکی پەیماننامەکە بڕوانە: فون هامەر، المصدر السابق، الجزء التاسع، ص٢٦٨-٢٦٩؛ شاكر صابر ظابط، المصدر السابق، ص٣٣-٣٤؛ د.جابر ابراهيم الرواي، المصدر السابق، ص٢٢٧؛ علي شاكر علي، المصدر السابق، ص٧٨-٧٩؛ منوجهر پارسادوست، سەرچاوەی پێشوو، ل٥١؛ عباس العزاوي، المصدر السابق، الجزء الرابع، ص٢٣٨.

(٩٤) بۆ زانیاری زیاتر لەمەڕ دەقی نامەکەی سولتان موراد بڕوانە، پاشکۆی ژمارە یەك.



نامەیەکی دیکەی لە مستەفا پاشاوە پێراسپێردرا تا ئەوەی بێگەیەنێتە دەستی شا(٩٥)، کە جیاوازییەکی ئەو تۆی لێ بەدی ناکرێت لە ناوەرۆکدا لەگەڵ ئەوەی سولتاندا.

ئەوەی پەیماننامەی زەهاو لەپەیماننامەکانی دیکە جیادەکاتەوە، ئەوەیە کە تەنیا پەیماننامەی ئاشتەواتی لە نێوان هەردوو دەوڵەتدا نەبوو، بەڵکو پەیماننامەی بنبڕکردنی گێرمەو کێشەی سنووری نێوان هەردوولا بوو کە لە شەڕی چاڵدێرانەوە دەستی پێکردبوو(٩٦)، ئەو سەرەڕای ئەوەی ئەو پەیماننامەیە بوو بەبەردی بناغەی پەیماننامەکانی دواتر کە لە نێوان دەوڵەتی عوسمانیو ئێرانی دەبەستران(٩٧)، بۆیە یەکێك لەسەرچاوەکان ئەو پەیماننامەیەی بە پەیماننامەیەکی نێو دەوڵەتی نێوزەد کردووە(٩٨)، هەروەها خاڵێکی دیکەی جیاکەرەوەی ئەو پەیماننامەیە ئەوەیە کە دوای بەستنی هەردوولا تاماوەی هەشتا ساڵ پابەندی بەندەکانی بوونو پەیماننامەکەیان نەشکاند، چونکە هەردوو دەوڵەت نەدەپرژانە سەر شەڕو ململانێی لەگەڵ یەکتری، لەلایەك بەهۆی خەریکبوونی دەوڵەتی سەفەوی بە باری ناوخۆی وڵاتو، لەلایەکی دیکەش بە هۆی خەریك بوونی دەوڵەتی عوسمانی بەشەڕ لەگەڵ نەمسا لەبەرەی ئەورووپا(٩٩).

سەبارەت بە کاریگەری پەیماننامەی زەهاو لەسەر کوردستان دوورنییە ئەو پرسیارە بێتە پێشەوە ئایا پەیماننامەی زەهاو کە لەنێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو سەفەوی بەسترا بۆ مەبەستی بنبڕکردنی گێرەو کێشە نێوانیان، چ پەیوەندییەکی بە کوردستانەوە هەیە؟!. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو پەیماننامەیە لە نێوان دوو دەوڵەت بەسترا کە هەر یەکێکیان بەشێکی کوردستانی بە هاوپەیمانی خۆی دەزانیو ناراستەخۆ دەستی گرتبوو بەسەریدا، بۆیە دەبێت کاریگەری خۆی لەسەر ئەو وڵاتە

(٩٥) بۆ زانیاری زیاتر لەمەڕ دەقی نامەکەی مستەفا پاشا بڕوانە، پاشکۆی ژمارە دوو.

(٩٦) نەجاتی عەبدوڵڵا، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣؛ د. عماد أحمد الجواهري، صراع القوى السياسية في المشرق العربي" من الغزو المغولي حتى الحكم العثماني"، مطبعة التعليم العالي، جامعة القادسية، ١٩٩٠، ص١١١.

(٩٧) د. سعدي عثمان هروتي، المصدر السابق، ص١٦٥.

(٩٨) د.جابر ابراهيم الرواي، المصدر السابق،ص٢٢٨.

(٩٩) منوجهر پارسادوست، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥١؛ علاء نورس، المصدر السابق، ص٦٧.

بەجێهێشتبێ، نەخاسمە ئەو پەیماننامەیە تایبەت بوویێت بە پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو ولاتی ناکۆکو سنووری نێوانیانی تیایدا دەست نیشان کرا بێت، کە کوردستان تەوەرێکی سەرەکی بووە لە تەوەرەکانی، چونکە کوردستان زۆربەی پانتایی سنووری جوگرافی هێزی هەر دوولای پێك دەهێنا، لێرەشدا دیارە گۆرینی هێلی سنووری جوگرافیای هێز بەسنوورێکی ئارەزوومەندانەو پشت بەستوو بەرێککەوتن دیسان کوردستانی خستۆتە ژێر کاریگەری سیاسەتی دێزە بەدەرخۆنەکردن، بۆیە بۆ وەلامدانەوە ئەو پرسیارە دەتوانرێت بوترێ پەیماننامەی زەهاو، خەنجەرێك بوو بەدەست هەردوو دەوڵەتی زلهێزەوەو، خاکی کوردستانی پێ شەقکرا، چونکە بەشێوازێکی چەسپاو لە پێشتر بەشێکی کەوتە ناو بازنەی قەڵەمڕەوی عوسمانیو بەشەکەی دیکەش کەوتە ناو بازنەی قەڵەمڕەوی سەفەوی.

لە لایەکی دیکەوە کاریگەریو ئەنجامەکانی پەیماننامەی زەهاو وەنەبێ تەنیا ڕازیبوونی هەردوو دەوڵەت بە دابەشکردنی کوردستان بێت، بەڵکو ناوی کوردستانی عوسمانیو کوردستانی سەفەویشی بەوشەی کوردستانەوە لکاندووە، لەبەر ئەوەی هەردوولا بە پێی بەرژەوەندیو ستراتیژیو ئایدیۆلۆژیای خۆی گەلی کوردو خاکی کوردستان لە خزمەتی خۆیدا بەکاردەهێنا، هەر بۆیە یەکێك لە لێکۆلەرەکان دەربارەی کاریگەری ئەو پەیماننامەیە دەڵێ:"... کارەساتێکی گرنگ بوو کە تەئسیری کردە سەر هەموو ڕووداوەکانی پاشە ڕۆژی مێژووی گەلی کورد"[١٠٠].

جیا لەوەی ئاماژەمان بۆ کرد ئەگەر لە ڕوویێکی دیکەوە سەیری کاریگەری پەیماننامەکە بکەین، ئەوا دەبینی کاریگەری بەسەر دەسەلاتی سیاسی ئەوکاتەی میرە کوردەکانیشەوە هەبووە، کە هەریەکەیان میرنشینێکی بەڕێوەدەبردو خاوەن قەلایەکی تۆکمەو بەهێز بوو، بۆ پارێزگاریو بەرگریکردنی دەسەلاتەکەی دروستی کرد بوو، کەچی بە گوێرەی بەندەکانی پەیماننامەکە هەردوو دەوڵەت پێکهاتبوون لەسەر کاولکردنو وێرانکردنی ژمارەیەك لەو قەلایانە کەوتبوونە سەر سنوور، بەمەش بە دیاردەکەوێت کە ناوچە کوردییەکان چ کارەساتێکیان بەسەر هاتووە[١٠١]. لێرەشدا دەتوانرێت

---

[١٠٠] د. عبدالرحمن قاسملو، کوردستانو کورد" لێکۆڵینەوەیەکی سیاسیو ئابووری، وەرگێڕانی: عبدالله حسن زادە، چاپی دووەم، چاپخانەی منارە، کتێبفرۆشی سۆران، هەولێر، ٢٠٠٦، ل٤٠.

[١٠١] نەوشێروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٠.



بوترێ پەیرەوکردنی ئەو سیاسەتەش بۆ ئەوە بووە تا میرە کوردەکان نەتوانن لەکاتی یاخی بوون قەلاکان بکەن بەحەشارگەو بانگی جیابوونی خۆیان ڕابگەیەننو، هەروەها لەو ڕێگایەشەوە دەسەلاتیان جلەو بکەنو لە قالبی بدەن، تا هەر کاتێك ویستیان لە دەسەلات لایان بدەنو سەروەرییان پێشێل بکەن.

خالێکی دیکە لە کاریگەری بەستنی پەیماننامەی زەهاو دەست بەتالبوونی هەردوو دەوڵەت بوو دوای پەیماننامەکە، بەمەش هەڵسان بەلێدانو کەمکردنەوەی دەسەلاتی میرنشینە کورردییەکان، لە ڕێگای بەکارهێنانی هەموو شێوازێك لە کوشتنو بڕینو تالانکردنی ناوچە کوردییەکان[١٠٢]، ئەوە سەرەڕای ئەوەی هەڵدەستان بە نانەوەی دووبەرەکی لە ناو خودی یەك میرنشینو نێوان میرنشینەکان[١٠٣]. بۆیە دەتوانرێت بوترێ مەبەستی سەرەکی هەردوو دەوڵەت لە ناوبردنو بنبڕکردنی دەسەلاتی سیاسی کوردی بووە، بۆیە سلیان لە هیچ نەکردۆتەوەو هەموو شێوازێکیان بەکارهێناوە.

لەلایەکی دیکەشەوە جێی خۆیەتی ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە بەندەکانی پەیماننامەی زەهاو کاریگەری هەبووە لەسەر باری ئابووریو کەمکردنەوەی ڕادەی بەرهەمهێنان لە کوردستاندا، چونکە بەپێی بەندەکانی پەیماننامەکە بڕیاری چۆڵکردنی بەشێکی زۆر لە ناوچە سنوورییەکان درابوو، ئەمەش کاری دەکردە سەر کەمبوونەوەی ڕێژەی بەرهەمهێنان کە دانیشتوانەکەی بە کشتوکاڵکردنو مەڕومالات بەخێوکردنەوە دەیانگوزەراند[١٠٤]. بۆیە دەتوانرێت بوترێ ئەگەر کوردەکان بە تەواوەتی پابەندی بەندەکانی ئەو پەیماننامەیە بوونایە، ئەوا لە ڕووی ئابووریشەوە زەرەرمەند دەبوون، چونکە بەندەکانی پەیماننامەی زەهاو سنوورێکی توندوتیژترو دابەشبوونێکی جێگیرتری لە کوردستان هێنابووە ئاراوە.

دواجار ماوەتەوە بڵێین پەیماننامەی زەهاو کاریگەری زۆری بەسەر خاکی کوردستاندا نەخشاندووە، بۆیە تا ئەمڕۆکەش مێژووی گەلی کورد قەرەبووی کاریگەرییەکانی دەداتەوە.

---

[١٠٢] ی، ئی، ڤاسیلیڤیا، کوردستانی خواروی ڕۆژهەلات" لەسەدەی حەڤدەوە تاسەرەتای سەدەی نۆزدە: کورتەیێکی مێژووی میرنشینانی ئەردەلانو بابان، وەرگێڕانی: رشاد میران، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٧، ل١٤٢.

[١٠٣] محمد امین زکی، المصدر السابق، ص٢١٧.

[١٠٤] فەرید ئەسەسەرد، سەرچاوەی پێشوو، ل٢١.

## ئەنجام

لە دوای شەنو کەوکردنی زانیارییەکانی دووتویێ سەرچاوە تایبەتدارەکانو هەڵدانەوەی مێژووی پەیوەندی عوسمانیو سەفەوی لەسەدەی حەڤدەهەمداو خستنە ڕووی پوختەی ئەو مێژووە، توێژینەوەکە بەم خاڵانەی خوارەوە گەیشتووە:

- ✓ ئەگەرچی بەر لە پەیماننامەی زەهاو هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو سەفەوی چەند پەیماننامەیەکیان بەستوو بوو، بەڵام ئەو پەیماننامانە نەیان توانیوە وەکو پەیماننامەی زەهاو کۆتایی بە کێشەو ململانێی نێوانیان بهێنن، بۆیە دەتوانرێت بوترێ پەیماننامەی زەهاو گرنگترین پەیماننامەی نێوانیان بووە هەم لە ڕووی مێژووی، هەم لە ڕووی سیاسی.
- ✓ پەیماننامەی زەهاو کوردستانی بەشێوەیەکی چەسپاوتر لە پێشتر دابەشکردووە بۆ دووبەش لە نێوان ئەو دوو دەوڵەتەو، کاریگەری زۆری کردۆتە سەر کوردستان لە ڕووی سیاسییو ئابووریو کۆمەڵایەتییەوە، چونکە ئەو پەیماننامەیە بە فەرمی لە ڕێگای ڕێکەوتنێکی دووانەیی دان نرا بە سنوورێکی قانوونی. لەو ئەنجامەشدا سنوورێکی فەرمی لە نێوان بەشی



کوردستانی رۆژهەڵات(سەفەوی)و بەشی کوردستانی رۆژئاوا( عوسمانی) دیار کرا، کە تاوەکو ئەمرۆکەش ئەو سنوورە وەك سنوورێکی نێودەوڵەتی لە نێوان تورکیاو عیراق لەلایەكو، ئێران لە لایەکی دیکە کاری پێدەکرێت

- ✓ ئەگەرچی ڕێی تێناچێ کورد لەلایەنی تیۆرییەوە ئاگاداری ئەو پەیماننامەیە بووبێت، بەڵام لەلایەنی پراکتیکییەوە هەر کە بەندەکانی پەیماننامەکە لەلایەن هەردوولاوە جێبەجێ کراوە، ڕاستەوخۆ یەخەی کوردی گرتووەو تەگەرەی بۆ دروستکردووە، بەمەش کورد لەنیاز پاکی ئەو دوو دەوڵەتە دردۆنگ بووەو، بە پەیماننامەکە قەڵس بووە، بۆیە هەتا ئەگەر بەسنوور بەزاندنیش بێت هەوڵیانداوە پێشێلی بەندەکانی پەیماننامەکە بکەن.
- ✓ دابەشکردنی کوردستانو خێلە کوردییەکان بەگوێرەی ئەو پەیماننامەیە چەند کێشەیەکی لەسەر سنووری نێوان هەردوو دەوڵەت دروستکردووە، وەکو کێشەی هاتووچۆ کردنو خاوەنداریەتی ئەو خێڵانە، بەڵام ئەوە مانای ئەوەنییە بەهۆی دابەشکردنی وڵاتی کوردەواری کێشەیەك بەناوی کێشەی کوردەوە سەری هەڵداوە، کە زۆرجار دەبووە هۆکاری ئالۆزی پەیوەندی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە، چونکە ئەو کێشەیە وەکو کێشەیەکی سیاسیو نەتەوەیەی دەرنەکەوت بەچەشنی دەرکەوتنی مەسەلەی کورد لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی، کە مەسەلەی کورد بووە مەسەلەیەکی مافو ئازادی دوا ڕۆژی گەلی کورد.

# سەرچاوەکان

**یەکەم: بەڵگەنامەبڵاوکراوەکان**

- ________.

سەرجەمی ئەو پەیماننانەی بەندن بەکێشەی نێوان تورك‌و فارس، وەرگێڕانی: نەزەند بەگیخانی، گۆڤاری کاروان، ژمارە(١١) خوولی ڕاپەرین، هەولێر، ١٩٩٤.

**دووەم: کتێبە چاپکراوەکان**

**أ: بە زمانی تورکی( ڕێنووسی عوسمانی)**

- مصطفی عبدالله کاتب چلبی.

فذلكة كاتب چلبي، الجزء الثاني، حوادث مطبعة سي،استانبول، ١٢٨٥الهجرية.

- مصطفی نعيما الحلبي.

تأريخ نعيما(أو-روضة الحسين في خلاصة اخبار الخافقين)، الجزء الثالث، استانبول، ١٢٨١الهجرية.

- فون هاممەر.

دولت عثمانية تاريخی، مترجمی: محمد عطا، الجزء التاسع، استانبول، ١٣٣٥ الهجرية.

**ب: بە زمانی فارسی**

-راجر سيوری.



ایران عصر صفوی، ترجمە: کامبیزی عزیزی، چاپ أول، تهران، ١٣٧٢ هەتاوی.

- د.عبدالله رازی.

تاريخ کامل ایران" از تأسیس سلسلة ماد تا انقراض قاجاریه"، تهران، ١٣٧٤ هەتاوی.

- کلیم الله توحیدی" کانیمال".

حرکات تاریخی کرد بەخراسان، جلد أول، چاپ دوم، مشهد ١٣٧١هەتاوی.

- محمد پناهی سمنانی.

شا عباس کبیر، چاپ أول، تهران، ١٣٧٣ هەتاوی.

- مظفر زنگنە.

دورمانی أریاتی( کردو کردستان)، چاپ سیهەم، بێ شوێن‌و ساڵی چاپ.

- منوجهر پارسادوست.

ریشەی تاریخی اختلافات ایران‌و عراق١٥١٤-١٩١٤، چاپ چهارم، تهران، ١٣٧٠هەتاوی.

**ج: بەزمانی کوردی**

- ئەولیاچەلەبی.

کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا( یان سیاحەتنامەی ئەولیاچەلەبی)، وەرگێڕانی: ناکام، بغداد، ١٩٧٩.

- د.جلیلی جەلیل.

کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، وەرگێڕانی: د. کاوس قەفتان، بەغدا، ١٩٨٧.

- سالح قەفتان.

مێژووی نەتەوەی کورد حالەتی سیاسی، مێژووی کۆمەڵایەتی، ئاوەدانی گەلی کورد، لەسەرەتای مێژووەوە، چاپخانەی سلمان الاعظمي، بەغدا، بێ ساڵی چاپ.

- شەرەفخانی بەدلیسی.

شەرەفنامە، وەرگێرانی: هەژار، نەجەف، ١٩٧٢.

- د.شەمسی محەمەد ئیکسەندەر.

مێژووی کورد لە سەدەی١٦، وەرگێڕانی: شوکر مستەفا، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیر، هەولێر، ١٩٩٨.

- د. عبدالرحمن قاسملو.

کوردستانو کورد" لێکۆڵینەوەیەکی سیاسیو ئابووری، وەرگێڕانی: عبداللە حسن زادە، چاپی دووەم، چاپخانەی منارە، کتێبفرۆشی سۆران، هەولێر، ٢٠٠٦.

- فەرید ئەسەسەرد.

گەشەسەندنی سەرمایەداری لە کوردستاندا زەمینەی ئابوورینەی بوزتنەوەی نەتەوایەتی، چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ، ١٩٨٤.

- ______ .

کورد لەئیسلوکۆپیدیای ئیسلامدا، وەرگێڕانی: حەمە کەریم عارف، چاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٩٩.

- م.س. لازاریڤ.

کێشەی کورد١٨٩٦-١٩١٧، وەرگێڕانی: د. کاوس قەفتان، بەغدا، ١٩٨٩

- محەمەد بایراقدار.

ئیدریسی بدلیسی، وەرگێڕانی: شکور مستەفا، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ١٩٩٩.

- محمد جمیل ڕۆژبەیانی.

فەرمانڕەوای موکریان، بەغدا، ١٩٩٢.

- نەجاتی عەبدوڵڵا.

کوردستانو کێشەی سنووری عوسمانی- سەفەوی ١٦٣٩-١٨٤٧، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.





- نەوشیروان مستەفا ئەمین.

کوردو عەجەم مێژوی سیاسی کوردەکانی ئێران، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٥.

لە پەراوێزی مێژوی ئەردەڵان، سلێمانی،١٩٩٩.

میرایەتی بابان لە نێوان بەرداشی رۆمو عەجەم دا، چاپی دووەم، سلێمانی، ١٩٩٨.

- ی، ئی، ڤاسیلیڤیا.

کوردستانی خوارووی ڕۆژهەلات" لەسەدەی حەڤدەوە تاسەرەتای سەدەی نۆزدە: کورتەیکی مێژووی میرنشینانی ئەردەڵانو بابان، وەرگێڕانی: رشاد میران، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٧.


## د: بە زمانی عەرەبی


- د.ابراهيم خليل أحمد.

تاريخ الوطن العربي في العهد العثماني١٥١٦-١٩١٦، جامعة الموصل، ١٩٨٦.

- د.جابر ابراهيم الراوي.

الحدود الدولية ومشكلة الحدود العراقية الايرانية، بغداد، ١٩٧١.

- حسين مجيب المصري.

صلات بين العرب والفرس والترك" دراسة تاريخيية ادابية"، قاهرة، دون سنة الطبع.

- د.سعدي عثمان حسين.

كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر" دراسة في علاقاتها الادارية والسياسية والاقتصادية مع ايالتي بغداد والموصل"، مطبعة سيما، كتيبفرؤشى سؤران، اربيل، ٢٠٠٦.

كوردستان والامبراطورية العثمانية"دراسة في تطور سياسة الهيمنة العثمانية في كوردستان١٥١٤-١٨١٥م، الطبعة الاولى، مطبعة خاني، دهؤك، ٢٠٠٨.

- شاكر صابر ضابط.

العلاقات الدولية والمعاهدات الحدود بين العراق وايران، بغداد، ١٩٦٦.

- شكري محمود نديم.

حرب العراق١٩١٤-١٩١٨، الطبعة الثامنة، بغداد، ١٩٧٤، ص١٣٥.

- صديق الدملوجي.

امارة بهدينان، الموصل، ١٩٥٢.

- عباس العزاوي.

تاريخ العراق بين إحتلالين، الجزء الرابع، بغداد،١٩٥٣.

- علي شاكر علي.

تأريخ العراق في العهد العثماني١٦٣٨-١٧٥٠"دراسة في احواله السياسية"، الطبعة الاولى، مطبعة دار الشعب، بغداد، ١٩٨٤.

- علاء نورس.

العراق في العهد العثماني" دراسة في العلاقات السياسية١٧٠٠-١٨٠٠، بغداد، ١٩٧٩.

- د. عماد أحمد الجواهري.

صراع القوى السياسية في المشرق العربي" من الغزو المغولي حتى الحكم العثماني"، مطبعة التعليم العالي، جامعة القادسية، ١٩٩٠.

- كارل بروكلمان.

تاريخ الشعوب الاسلامية، ترجمة: نبية فارس ومنير البعلبكي، الطبعة السابعة، بيروت، ١٩٧٧.

- د. كمال مظهر أحمد.

دراسات في تاريخ ايران الحديث و المعاصر، بغداد، ١٩٨٢.

- لسترنج.

بلدان الخلافة الشرقية، ترجمة بشير فرنسيس وكوركيس عواد، مطبعة الرابطة، بغداد، ١٩٥٤.

- لونگريك.

اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ترجمة: جعفر خياط، الطبعة السادسة، بغداد، ١٩٨٦.



- مأمون بك بن بيكه بك.

مذكرات مأمون بك بن بيكه بك، ترجمة: محمد جميل الروژبيانى و شكور مستەفا، مطبعة المجموع العلمي العراقي، بغداد، ١٩٨٠.

- محمد امين زكي.

خلاصة تاريخ الكرد والكردستان من اقدم العصور التاريخية حتى الان، ترجمة: محمد علي عوني، مصر، ١٩٣١.

- محمد فريد بك المحامي.

تاريخ الدولة العلية العثمانية، بيروت،١٩٧٧.

- نظمي زادة مرتضى افندي.

گلشن خلفاء، ترجمة: موسى كاظم نورس، مطبعة الاداب، النجف، ١٩٧١.

**سێیەم: گۆڤارەکان**

- لازاريف.

تێكۆشان هەر بەردەوامە، وەرگێڕانی: سەنتەری برایەتی، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە(٧) هەولێر، ١٩٩٧.

**چوارەم: ئینسکلۆپیدیا**

بارتولد، مادة اخالضيخ، دائرة المعارف الاسلامية، المجلد الثاني.

سترك، مادة بيرەچك، دائرة المعارف الاسلامية، المجلد الرابع.

كراموز، مادة اسكودار، دائرة المعارف الاسلامية، المجلد الثالث.

مورتمان، مادة ابراهيم باشا، دائرة المعارف الاسلامية، مجلد الاول.

# پاشکۆی ژمارە یەك

دەقی موتمن الملك- بۆ پەیماننامەی زەهاو

پەیماننامەیەك کە لە مێژووی شەوالی ١٤٠٩ کۆچی لەنێوان شاسەفیو سوڵتان

موڕادی چوارەمدا بەستراوە[١٠٥]

نامەی سوڵتان موراد

بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

بێ یەزدان هیچ توانستو هێزێك نییە

"دوای عومدە الخواصو موقەرەبین ساروخان کە لەلایەن وەزیری ئەعزەم جەلیلول میقدار دەستوری ئەکرەمو موشیری ئەفخەم نیزامی عالەم نازم مەنازمی ئومەم مستەفا پاشا خودا پایەداری بکا، کە لەلای ڕۆژهەڵاتەوە سەردارو سوپا سالاری ئێمەیە، بە نوێنەرو نێردراو لە زەهاو بەیەکگەیشتوون لە بارەی پێکهاتنەوەو ڕێککەوتنو جێبەجێ کردنی مەسەلەکانی کۆتایی هێنا بەکێشەی سنوور، گفتوگۆو دانووستانیان کردووەو بڕیاریان داوەکە سنوورو کەوشەنێك کە لەڕێگای بەغداو ئازەربێجان هەڵکەتووە، ناوچەکانی ناودێر بەجەسانو بەدرە بۆ ئێمە بێو ناوچەی مەندەلی هەتا دەرەتەنگ (شوێنێك کە پێی دەوترێ سەرپیل لە سنووری دەرەتەنگ) لەگەڵ ئەو بیابانانەی کە نێوانیاندان بۆ ئێمەنو، چیایەك کە لەنزیك وێدا هەڵکەوتووە بۆ ئەوانە، ومیل باشی کە لەگەڵ دەرەتەنگ سنووری دیارو لەبەرچاوانە لەگەڵ دەرنە بۆ ئێمەن، لە هۆزی جاف تیرەکانی بەناو زیائەدینو هارونی وابەستەی دەربارەی بەرزی هۆمایونی ئێمە دەبێو، بیرەوزەردوویش بۆ لای بەرانبەر دەبێ. قەڵای زنجیر کە لەسەر

[١٠٥] ئەو پەیماننامەیە عوسمانییەکان دەریان خستووە، چونکە دانەی ڕاستو دروستی ئەو پەیماننامەیە لەبەر دەستدا نییە، بۆیە ناتوانرێت لەبارەی ڕاستو دروستی یان چەوتیو چەوێڵی هیچ بوترێ. منوجهر پارسادوست، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٨٧.



کێوێك ڕۆنراوە تێك دەدرێتو دێهاتەکانی ڕۆژئاوای ئەو قەڵایە بۆ ئێمەنو ئەوانەی لە ڕۆژهەڵاتی قەڵای ناوبراون بۆ ئەوانن. چیایەك کە لە نزیك شارەزوورەو قەڵای زەڵمی لێیە هەر شوێنێك کە بەسەر قەڵای ناوبراو دادەڕوانێت لایەنی هۆمایونی ئێمە بەسەر ڕادەگا، قەڵای هەورامانو ئەو گوندانەی کەسەر بەو قەڵایەن بۆ لایەنی بەرانبەرن. گەدوك چغان کە لەگەڵ شارەزوور سنووری دیارە لەگەڵ قزلجەو ناوچەکانی ئەوێ لایەنی هۆمایونی ئێمە بەسەری ڕادەگاو، میهرەبانو ناوچەکانی ئەوێ بۆ لایەنی بەرانبەرن. هەردوولا بەڵێن دەدەن کە لەسەر تخوبی وان هەردوو قەڵای قوتوورو ماکۆو لەلای قارس، قەڵای مغازبرد تێکدەدرێت، وە هەروەکو چۆنلەو نامەیە بەراشکاوانە ئاماژە کراوە کە بەقەول قەرارێك کە دوو نوێنەر لەسەری ڕێککەوتوونو قایل بوون، من پەیمان دەدەم کە ڕێو ڕەسمی پەیماننامەکەو خاترگرتنی یەکتریو پێویستییەکانی پێکهاتنو بەین ڕێکبوون تۆکمە دەکەمو بەبەڵێنی خۆمان وەفادار دەبین، وەخۆمان لە شکاندنیو تێدانی ئەوپەیماننامەیە دەبوێرین، هەروەکو داوا دەکرا ئەو نامە مۆرکراوەی کە لەلایەنی جەنبتانەوە گەیشتووە جێی ڕەزامەندی دەرباری بەرزی ئێمەیە، بەو مەرجەی کە تایەفەی قزلباش لەو ناوچانە دەست بکێشنەوە کە سەر بەخاكو وڵاتی ئێمەن. ئەو ناوچانەش سنوورو کەوشەنیان دیارو لەبەر چاوەو دەبێ وابەستە ببنەوە بەدەرباری پایەدارو دادپەروەری هۆمایونی ئێمەوە، ئەو زەویانە جا چ ئاوەدان بن یاخود چۆڵو هۆڵ بەو پێیەی الشيء اذا ثبت، ثبت بەلوازمە. لەگەڵ هەموو ئەو شوێنانەی کەسەر بەو ناوچانەن دەخرێنە ژێردەستی نێردراوانی بارەگای بەرزو باوەڕپێکراوی دەروازەی باڵای ئێمە، سەرەڕای ئەوەی ئاماژەمان بۆ کرد، هەروەها دەبێت تایفەی قزلباش دەست نەکێشنە ناو کاروباری ئەو قەڵاو پانتاییو دەوروبەریو بیابانو دەشتو تەپۆڵکەو شاخانەی کە دەکەونە ناو ئەخسخەو قارسو وانو شارەزوورو بەغداو بەسرە، وە بەپێی یەك لە مەرجە ئاشکراو دیارەکانی ئەو پەیماننامەیەی کە لە دەورانی سەعادەتی باپیرانی مەزنی ئێمە خودا بەڵگەکانیان نورانی بکات کە بۆ پێشینەکانی ئێوە نێردراوە وەبەو گوتەیەی کە ئاین ئامۆژگاریە نابێت ڕێگا بە هەندێك لە پڕوپوچو

هێر بدرێت کە لەژێر سایەی حکومەتی ئێوەدان کە سووکایەتی یان زمان درێژی بکەنە سەر هەردوو شێخی نورانیی و هاوسەری پاکیزەی پێغەمبەری سەنگین، وە سەرجەم یاوەرانی پایەبڵندو پێشەواو موجتەهیدانی ئاین خواد لێیان ڕازی بێت، وە نابێت بە هیچ شێوەیەك ڕێگا بە کاری نابەجێیی و زمان درێژی بدرێت مادام ئەو پەیماننامەیە تا کۆتایی سەدەکان بەقەرارو کارپێکراو دەبێت و لە لایەن ئێوەوە پێشێلکاری و جموجۆڵی ناشایستە ڕوونەدات، مەرج و پابەند بونێك کە بەو جۆرەی باسکراو نوسرا لەلایەن شەرەفی شاهانەی ئێمەوە لەبەر چاوگیراوو پارێزراو دەبێت، بۆیە دەست ناکێشرێتە ناو کاروباری خەڵك و خاکی ئێوە لەبەرانبەر ئەو پەیماننامەیەی کە ناردبووتان، ئەم نامەیەی هۆمایونی ڕاستگۆییانەی ئێمەش نوسراو قەڵەم لێدراوە کە لە نێوانی ئێمەدا ناخۆشی وەلا بنرێت و دواتر ڕەچاوی مەراسیمی پێکهاتن و دڵاوایی بکرێت، وەسەفیری نێدراویش شەرەفی ماچ کردنی ڕاخەی شاهانەی ئێمەی بەشانازییەوە پێبرا، دوای ئەوەی ئادابی نێردەیی بەهەق جێبەجێ کرد، بەپێی مۆڵەتی شاهانەی ئێمە بۆ لای ئێوە گەڕایەوە، وە لەگەڵ ویدا ئیفتخار ئەلئەماجد وە ئەلئەکارم محەمەد هەر سەر بڵند بێت کە خزمەتکارانی قاپی ئێمەیە ڕەوانە کراوە، کە فەرمان پێکراوە بەگەیاندنی نامەی هۆمایونی ئێمە، ڕێخۆشکەری خێرەو مەندانی دین و دەوڵەت روکاری چاکان پاشای مەنان سەناو پیاهەڵدان بۆ خودای بەندان و پێغەمبەرو یاوەرانی سەنگین و گرانی، لەسەرەتای مانگی شەوالی موکەرەم ساڵی ١٠٤٩ی کۆچی دەرکراوە"[١٠٦].

(١٠٦) منوجهر پارسادوست، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٨٢-٤٨٤.



# پاشکۆی ژمارە دوو

دەقی نامە مستەفا پاشا

دەقی بلیچ(**Blech**)ی پەیماننامەی زەهاو

" ستایش بۆ خواوەندی پەروەردگاری بەخشندەو میهرەبان کە دەربارەی ڕێککەوتن و ئاشتەوایی بە شێوەیە فەرموویەتی(بەڕاستی هیچ شتێکم بەئەندازەی ئاشتی و پێکهاتن داوا نەکردووە) ئەو( ئاشتی) تاریکی جەنگ و ناکۆکی بەروناکایی و ئارامی و شادی وەلادەنێ تا ئەو وەختەی کە گۆڵەکان بۆنی خۆیان دەپرژێنن و خۆر( بۆ جیهان) روناکایی دەبێت سەلەوات و نزای خێر لەسەر پێغەمبەر کە بەتەواوی و ڕەخساوی باوەڕبوونی (بەخودا) ئاشکرا کردو ئیسلامی پیرۆزی باڵا دەست و سەرفراز کرد، بەهەمان شێوە سەلەوات لەسەر بنەماڵەو منداڵ و یارو یاوەرانی وی کە گەیاندنی ئەو بیروباوەڕە کۆششیان کردووە.

ئێستاکە بە تواناو خواستی خوداوەند، پەروەردگارێك کە ئاسمانەکانی بەبێ پایە ڕاگیرکردووەو بەزانیین و توانستی ڕەهای خۆی هەموو شتەکانی لەڕەگەزی پێکهاتەی جۆراوجۆر هێناوەتەوە بوون، خوداوەندێك کە هاوتای نییەو پێڕەوی شایستەی بۆ کۆمەڵگا داناوەو پاراستنی جیهالنی بەدادپەروەری و ویژدانی پاشایان کە بەباشی تێگەیشتن و یەککگرتوون لەسەروی ئەمانەشەوە بەپەیرەوکردنی حکومی خودای بەئەنجام گەیاندن سپاردووە بە سوڵتانەکانی هۆمایونی کە بۆ بەرێوەبردنی ئەو دەستوورە پیرۆزە( لەخوداوەند بترسن و لە نێو خۆتاندا ئاشتی بکەن) ڕوویان لە پێکهاتن کردووە کە سەرچاوەی کامەرانییە، پشتیان کردۆتە ناکۆکی و ناتەبایی، شمشێری دژایەتیان خستۆتە کالانەوە، ئەو میللەتانەی کە جەنگ لە دژی یەکدی بەرپادەکەن، دۆستانە لەگەڵ یەکتری ئاشتیش دەکەن( ئەوە، بەخششێکی خواییە، کە پەروەردگار دەیدا بەو کەسانەی کە لێیان قایلە).

بەو پێیە من ناچیزەترین هەموو بەندەکانی خودا، فەرمان پێکراوو هەڵبژێردراوم بەو شێوەیەی کە بە مەسلەحەتی بزانم هەر کارێك کە پەیوەندی بە ئیمپراتۆریەتی (عوسمانی)و میللەتەکەیەوە هەیە بیکەم یان نەیکەم شەڕو ئاشتی یەکلا بکەمەوە، هەڵبژاردنێك کە لەلایەن مەزنترین پاشاوە کراوە کە بەرگریکەری دینی ئیسلامەو وەهەم وەکو سولەیمانیش خاوەن دەسەڵاتو پایەیە، کە جێنشینی خوایە لەسەر زەوی ئەو گۆتە حەکیمانە پڕ بەپێستە، کە( یەك سوڵتانی عادل، سیلەی خودایە لەسەر ڕووی زەمین) پەناگای گەورەترین پاشایانی موسڵمان، گیان پارێزی بەرزترین فەرمانڕەوایانی تورك، پارێزەری ئیسلامو موسڵمانان، نابود کەری کافرو خودانەناسان، سوڵانی دووبەڕو دووبەحر سوڵتانی دوو ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا، خزمەتگوزاری دووشار پیرۆز، کەنجینەی مرۆڤایەتی کە قابیلی پاراستنە لەلای خودی خوداوەندەوەو شایانی گرنگییە لەلای خوداوەندی تەبارەكو تەعالاوە، کە بنەماڵەی ئیمپراتۆریەتی تاکۆتایی دونیایی بەردەوام دەبێتو دەسەڵاتی ئەوان تا دوای هاتنی هەموو چەرخەکان بە خوردار بێت. بەلەبەر چاو گرتنی بە تەواوی دیاریکردنی منو پێگەی من وەکگو نوێنەری سوڵتان، فەرمانمدا بە جەنگاوەرانی سەرکەتووی تورك کە لەبەغداوە بجمێن بەمەبەستی پێشڕەویکردن بەرەو خاکی ئێران بکشێن، بە گەیشتنمان بۆ ناوچەی هاورینە شەمسەددین محەمەد قولی بەگ میر ئاخۆری سەڵتەنەتی کە لەنێو سەر گەورانی ئێراندا لە هەموان بەناوبانگترە وەکو سەفیر لەلای ئێوەوە کە جوانبەخشی پاشای ئێران شکۆی قەڵەمڕەوو کیشوەری جەمشید کە مەزنی ئەو بەقەدەر مەزنی داریوشە، شای گەورەو فەرمانڕەوای ناودار مرواری گرانبەرهای خانەدانی شاهی، خۆری ئاسمانی حکومڕانی هەڵی پڕ هەیبەتو شانو شەوکەتی پاشایی، دیارترینو شکۆمەندترین شا کە ژمارەی جەنگاوەرانی بەقەدەر ژمارەی ئەستێرانە، خوداوەندی باڵادەست ئالای دەسەڵاتی وی لە زەمینەوە بۆ عەرش باڵاکاتو تەلاری مەزنی شاناو ئامێزی وی تاکە شکەڵانی ئاسمانی بەرزو باڵاکات، هاوڕێ لەگەڵ نامەیەك لە لایەن ئێوەوە بۆ پاشای گەورەو شکۆمەندی ئێمەو، هەروا بەنامەیەکی شائنابوونەوە بۆمن گەیشتە هارونییە.



سەفیر بە نیشاندانی مەیلی خۆی بەوەی کە پێویستە ئاگری شەڕ خامۆش بکرێتو تەمی ناکۆکی بڕەوێنرێتەوە، ئاشکرای کرد کە مەقامی بەرزی پاشای وی وای پێی باشە کە سولحو ئاشتی لەنێوان هەردوو وڵاتدا بەرقەرار بێت، وەمن هەروا لەترسی لوت بەرزانە ڕەفتارکردن وەبەپێی ئەو ئایەتە پیرۆزە( ئەگەر ئەوان حەزو نیازیان لەئاشتوایی بوو تۆش هەروا بەو پەیوەندیان لەگەڵ بکە) ئەو نامەیەی کە لەلایەنی شاوە هاتووە لە ناوەڕۆکیدا نووسراوە کە مەقامی بەرزی شاهانە کەسێکی بڕوا پێکراو کەل کاروباری هەردوو دەوڵەتی( ئێرانیو عوسمانی) ئاگادارە بۆ دیارکردنی مەرجەکانی ئاشتیو ڕێککەوتن دیاری کراوە، لە ئەنجامدا شا بەپێی ڕێساو ئسولی داندراو ساروخان کەسایەتی بەرزو جێ بڕوای خۆی هەڵبژرادوە کە دەربارەی پێکهاتنو بڕیاردان دانوستان بکاو ڕێککەوتن ببەستێو کەوشەنەکان دیاری بکات، ئەویش هەمیشە لایەنگیری هەر کارو چالاکییەکە کە لە سۆنگەیەوە ئاسایشو ئارامی پێك بێت، ساروخان هەر بەگەشتنی بە ئۆردوگای ئیمپراتۆری لە زەهاو بەڕێو ڕەسمی میوانداری پێشوازی لێکرا لە ڕۆژی ١٤ی محرەمی ساڵی ١٠٤٩ی کۆچی پێغەمبەر باشترین نزای خێری لەسەر بێت، دانشتنێك لە ئۆردوگای ئیمپراتۆری پێکهات لەو دانیشتنەدا وەزیزانی دیارو میری میرانو ئاغایانی فەرماندەو ئایانی یەنی چەریو شەش ئاغا لەشەش سوپاو سەرجەم فەرماندەکانی سوپا ئامادەبوون، ساورخان نوێنەری تایبەت کە متمانە بەوی جێگەی بڕوا بوو، هەورەها سەفیر محەمەد قولی بەگە لە دانیشتنەکەدا ئامادەبوو، دەمو دووقسەو باسو دانوستانکراو، لە ئەنجامدا هەردوو لەسەر شێوازی خوارەوە ڕێکەکەوتن.

جەسانو بەدرەو مەندەلیو دەرەتەنگو دەرنە لەقەڵەمڕەوی پاشای بەغدا لە ژێر فەرمانداریەتی پاشای شکۆمەندی ئێمە دەمینێتەوە، هەروا زەوییەکانی نێوان مەندەلیو دەرەتەنگ لەژێر فەرمانی ئەواندا دەبێت،لەگەڵ چیای( نزیکی ئەوێ) سەر بە شا دەبێت، سەربیل وەکو سنووری نێوان دەرەتەنگو دەرنە دیار دەکرێت، ئەو بەشە لەناوچەی هارونییە کە شوێنی هۆزەکانی جاو زیائەددین سەر بەسوڵتان دەبێت، بەڵام

بیرەو زەرودونی لە دەستی شادا دەمینێتـەوە، قـەڵای زنجیر لەسـەر کێوێـك ڕۆنـدراوە خاپوور دەکرێو ئەو دیهاتانەی لای ڕۆژئاوای ئەو قەڵایە سەر بە سـوڵتان دەبـنو ئـەو دیهاتانەی لای ڕۆژهەڵاتی قەڵای ناوبراو بـۆ شـا دەبـن، ئـەو گوندانـەی کـە لەچیای بەرزی(زەڵم)ن لەگەڵ قەڵایەك کە لەنزیك شارەزوور هەڵکەوتووە لە ژێردەستی سـوڵتان دەبنو ئەگوندانەش کە لەلای ڕۆژهەڵاتی ئەوێن بەقەڵای هەورەمانو گونـدەکانی سـەر بەوێشەوە ئەوا لە ژێر حوکمی شادا دەبێت، ئەو شیوە شاخەی کە بە شارەزوور کۆتایی دێت وە کەشەنێکی دیار دەمینێتەوە، قەڵای قزلجەو ناوچەکانی سـەر بـەوێ بـۆ دەبـن قەڵای قوتورو ماکۆ لەسەر سنووری وانو قەڵای مەغازبرد لـەلا وانو قـارس لەلایـەن هەردوولاوە تێکدەدرێت، مادام شای(ئێران) دەست ناکێشێتە ناو کاوربـاری قـەڵاکانی ئەخسخەو قارسو وانو شارەزوورو بەغداوبەسرەو سەرجەم ناوچەکانو هەرێمەکانی کە دەکەوێتە نێو ئەو ناوچانەی وەکو قەڵاکانو پێگە سـەربازییەکانو ناوچـەو زەویو زارو تەپوڵکەو شاخەکانی وڵاتی ئەوێوەو کاری هاندان بۆ سەر بزێویو ناپـاکی لەلایەنیـەوە ناکریت، لەلایەنی پاشاو مەزنو باڵای ئێمەشەوە بەڵێن دەدرێت کەرێز لەو ڕێککەوتنە بگیرێتو بەهیچ شێوەیەك لاساریو پێشیلکاری بۆ ئەو ڕێککەوتنەو بەو خاڵو شوێنانە کە بەن دەستی ئەو لایەنەدایە ناکرێت.

بەپێی ئەوە بەمەبەستی ئەوەی کە بازرگانو موسافیرانی هەریەك لەو دوو لایـەنـە (بۆخاکیو وڵاتەکەی تر) بێتو بچنو لەگەڵ ئەوان ڕەفتاری دۆستانە بکرێت، لەبەرچاو گرتنی ئەو هەڵاوێریو مۆڵەتەی کە بەمن دراوە ئەو ڕێککەوتنە پیرۆزە کە لایـەنگیری ناوەرۆکەکە دەکەم دەی نووسمو دینێرم بۆ پاشای مەزنی( ئێران)و پاشـای شـکۆمەنی ئێمە، مادام کە شا بەجێبەجێ کردنی ئایەتی( پاش ئەوەی بە ڕێککەوتن قایـل بـووی پێشێلی مەکە) مەرجەکانی ئەو ڕێککەوتننامەیە دەپارێزیو بەسەری ڕادەگات، پایـە بـەرز ئیمپراتـۆر پاشـای زۆر شـکۆمەندی ئێمـە، هـەروەها پـەیڕەوی ئـەو ئایەتـە پیرۆزە(پەیمانی خۆت بەجێ بگەینە، چونکە بەجێ گەیاندنی پەیمان واجبە) دەکاتو بەو پێیە کار دەکات.



ئـەو ڕێککەوتنـە قایـل بوونـە پـەنا بـەخوا تـا ڕۆژی قیامـەت درێـژەی دەبـێو دەپارێزرێت( وەنەبادا کەسێك پاشی ئاگا بوونی لەوە، ئەوە بگۆڕێو بەڕسـتی ئەوانـەی دەیگۆڕێت گوناحبارە). سـتایش بـۆ پـەروەردگار کـە خوداوەنـدێکی تـاکو تەنیایـەو سەلەوات لەسەر ئەو دوایش لەسەر پێغەمبەر.

ناچێزەترین بەندەی خودا
مستەفا وەزیر ئەعزەم"[١٠٧].

[١٠٧]منوجهر پارسادوست، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٨٤-٤٨٦.

# ملخص البحث باللغة العربية

منذ زمن ونحن نرى في المصادر التأريخية ذكرا لاسم معاهدة (زهاو) جنبا إلى جنب مع مع مسألة تقسيم كردستان، نشأت فكرة هذا البحث المتواضع لغرض رفع الستار عن تأثير هذه المعاهدة على كردستان. البحث في هذا الموضوع له أهميته الخاصة بسبب ذلك يمكن ان ندرك حقيقة الصراع بين العثمانيين والصفويين في هذا المرحلة، كذلك نستطيع الوقوف من خلال هذا البحث على العوامل التي تخرج هذه الاتفاقية من صفوف الاتفاقيات الآخرى وتضعها في المراتب الأولى من حيث الأهمية والشهرة والتأثير، إضافة إلى ما يحمله هذا البحث من مجموعة من المعلومات التأريخية المهمة عن الكرد وكردستان في ذلك الحين.

من الجدير بالذكر الإشارة إلى أن النص الأصلي لهذه المعاهدة مفقود عند كلا الدولتين، لذلك البحث في هذا الموضوع يحتاج إلى معلومات كثيرة وإلى دقة في العمل وتأملٍ فيه، هذا لكي يستطيع الباحث أن يتعامل بسهولة مع هذه المعلومات ويبين صحتها، ومع هذا ليس من السهل بيات تأثيرات هذه المعاهدة على كردستان، فعلى الباحث أن يعتمد على معلومات تأريخية لكي يقوم بتحليلات منطقية، في هذا النوع من المحاولات يواجه الباحث مجموعة من المتاعب والمصاعب، لاسيما إذا كان معظم المصادر الرصينة الأصيلة المعاصرة مكتوبة بلغات مختلفة، فلا شك في أن فهمها وترجمتها ليس بالعمل السهل، على الرغم من ندرة هذه المصادر في مكتبات الإقليم.

يتألف هذا البحث من مقدمة وفصلين، تتبعها الاستنتاجات، الفصل الأول عنوانه: تأثير صراعات ومعاهدات العثمانيين والصفويين في كردستان خلال السنوات (١٥١٤–١٦١٨)، ويتضمن محورين، في المحور الأول تمت الإشارة إلى بدايات ظهور هذا الصراع مع ذكر لأسباب استمراريته إلى سنة (١٦١٨)، إضافة إلى الوقوف على تأثيرات هذه الصراعات والمعارك في كردستان، وفي المحور الثاني تمت الإشارة إلى المعاهدات التي كانت موجودة بين العثمانين والصفويين قبل معاهدة ( زهاو).



الفصل الثاني مخصص للحديث عن الظروف والأرضية لعقد معاهدة (زهاو) (١٦٣٩)، وتم هذا في محورين، المحور الأول عرض طبيعة العلاقات بين كلا الدولتين قبل عقد المعاهدة، خصوصا بعد ارتداد بكر سوباشي في بغداد، مما أدى إلى نشوب حرب بينهما من جديد، وفي النتيجة حدثت ثلاث هجمات متتالية أضرت بكردستان أضرارا بالغة. المحور الثاني مخصص للظروف والأرضية لعقد معاهدة ( زهاو) وتأثيراتها في كردستان وهو هدف البحث، وهناك تمت الإشارة إلى محاولات كلا الجانبين لعقد المعاهدة، وكتابة بنودها، وفي النهاية وقفنا على النقاط المهمة والمؤثرة التي تركتها هذه الاتفاقية على كردستان وتأريخ كردستان.

وفي الاستنتاجات تم عرض أهم النقاط التي توصل إليها البحث.

ولا ننتظر أن يكون هذا البحث بعيدا عن الخلل والنقص، فالكمال لله وحده، ومن هذا المنطلق نرجو أن ينظر إليه بعين ناقدة لملء الفراغات الموجودة فيه، لكي يفتخر البحث فيما بعد بأنه بحث خدم ولو بجزء يسير كشق تمرة تأريخ شعبنا الكردي، والتوفيق من الله العلي القدير.

# (Abstract)

Long times ago from historical sources, the Zahaw agreement band in parallel to the Kurdistan division case has been discussed. To shed a light on the effects and the out results of this agreement the den of this study is produced. Making research on this agreement band has its significant by which one can realize the struggles between Ottmanians and Safawies at that time. Depending on these effects in which changes the agreement in the list of agreement bands. In addition, this study has the ability to present a mounts of data a bout Kurds and Kurdistan.

Worth mentioning, it is of crucial importance to refer to the fact that the content of that treaty is missing between Ottmanians and Safawies. The study about this subject needs to have adetailed information and authentic so that the researcher deals with the in formation accurately-Besides, this is not an easy task to show the effects of this treaty on Kurdistan. For this reason the researcher should depend on historical and authentic sources so as to analyses the materials logically. During these attempts the researcher finds many obstacles because the sources are written in different languages indention, translating these sources are



not an easy task also the lack of availability of these sources in Kurdistan region libraries.

This research is composed from a preface, two chapter, and consequences.

The first chapter which includes two sections dealing with the effects and struggles treaty between Ottmanians and Safawies state on Kurdistan during the years of(١٥١٤-١٦١٨).

The second chapter also divided on two sections. The natural relationship between the two states Ottmanians and Safawies before the Zahaw treaty is being discussed and the effects of this treaty on Kurdistan is being analyses and studied.

In conclusion, the results that are gained from the study will be mentioned.

One can not say that this study is perfect but hope that your critical points will help me to develop and enrich thy study. God help us all.